# مەرجێن حیجابا دروست بۆ ژنا موسلمان




دانان
أبو عبدالله ليث الحيالی

وەرگێران
شیڤان شێخەمیری



مزگەفت
www.mzgaft.com

# مەرجێن حیجابا دروست بۆ ژنا موسلمان

(ئەڤ پەرتووکە بۆ دیارکرنا حیجابا دروست و مەرجێن وێیە، هەروەسا تەفسیرکرنا ئەوان ئایەتێن ل دۆر حیجابێ هاتین و گۆتنێن زانایان ل دۆر حیجابا دروست)

دانان

خزمەتکارێ پەرتووکا خودێ و سوننەتا پێغەمبەریﷺ

**أبو عبدالله ليث الحيالي**

وەرگێران

**شیڤان شێخەمیری**

ناڤێ پەرتوکێ ب عەرەبی: شروط الحجاب الشرعي للمراة المسلمة

ناڤێ پەرتوکێ ب کوردی: مەرجێن حیجابا شەرعی بۆ ژنا موسلمان

ناڤێ نڤێسەری: ابو عبدالله لیث الحیالی

ناڤێ وەرگێری: شیڤان شێخەمیری

پێداچوونا زمانی: وەحیدا ئیبراهیم

دیزاینا ناڤەروکێ: نورالله سامی

دیزاینا بەرگی: سایتێ مزگەفت - www.mzgaft.com

چاپ: ئێکێ 1444 م 2022ز

## ناڤەروک

## دەستویریا وەرگێرانێ

الحمدلله, والصلاة والسلام على محمد رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه, وبعد :

پشتی مە خۆلەک ب ڤێ پەرتووکێ ڤەکری ل گرۆپێ (**دایکا زەکییا بۆ زانستێن شەرعی**) ل 14 / 8 هەتا 25 / 8 /2021 و پتر ژ (135) خوشکا بەشداری تێدا کری، بۆ وان بوویە جهێ مفا وەرگرتنێ، هندەک ژ خوشکا ڕابوون ب نڤێسینا ئەوان وانێت مە دخولێدا گۆتین، مە دیت جهێ مفاییە ئەگەر بهێتە بەلاڤکرن، ژبەر گرنگیا ئەڤی بابەتی د ڕۆژەڤا ئەڤرۆدا، هەر بۆ ئەڤێ چەندێ من دەستیریا وەرگێرانا ئەڤێ پەرتووکێ بۆ زمانێ کوردی ژ (شيخ أبو عبدالله ليث بن عبدالواحد بن محمود الحسني الحيالي) خاست، سەیدای ژی ب خۆشحالیڤە گۆت: (أذنت لكم نفع الله بكم وبعلمكم, وزادكم الله من فضله, وجزاكم الله خيرا).

ئانکو: من دەستیریدا هەوە خودێ مفای ب هەوە و زانینا هەوە بکەت، خودێ قەنجی وکەرەما خۆ ل سەر هەوە زێدەبکەت و خودێ پاداشتێ هەوە ب خێرێ بدەت.

ل ڕۆژا ئێکشەمبێ

22 / 8 / 2021 زاینی

14 محەرەم 1443 مشەختی

# پێشەکییا وەرگێری

بسم الله, الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه: وبعد

بێ گومان ئیسلام یا هاتی دا ژیانا مرۆڤی رێک بێخیت ژ بێ سەروبەرییێ بەرەڤ رێکخستن و رێکوپێکییێ, و ژ خوشیا دەم کورت بۆ خوشیا هەروهەر, و بۆ هەرکەسێ ماف وئەرکێن وی یێت دیارکرین, دا کو کەس پێ ل توخیبێت یێ دی نەدانیت, ژوان ژی ژن, کو خودایێ مەزن یا ل سەر فەرز کری ئەو خەمل وجوانیا خو بنخێڤیت ب حیجابا شەرعی ل دەمێ ئەو ل نک هندەک زەلامێن بیانی بیت کو دروست بیت لێ بێتە مارەکرن.

بەلێ ئەڤێ حیجابا شەرعی هندەک مەرج و رێساییێن خو یێت هەین دڤێت تێدا بجهـ بهێن هەتا دشەریعەتی دا پێ بهێتە گوتن: حیجابا شەرعی.

ڤێجا هەر بو ڤێ چەندێ شیخێ بەرێز (ابو عبدالله لیث الحیالي) خودێ بپارێزیت دڤێ پەرتوکێ دا بەحسێ ئەوان مەرج ورێسا وئەحکام وبەلگەیێن حیجابا شەرعی وچەندین بابەتێن دی یێن پێڤە گرێدای دکەت, کو هەکە ژنا موسلمان بخوینت وکار پێ بکەت دێ مفایەکێ باش ژێ بینت ان شاءالله.

وهەر بو پتر رونکرنا بابەتێ حیجابێ ل دوماهیا پەرتوکێ من گوتارەک دڤی دەربارەی دا یێ لێ زێدەکری, هیڤیە جهێ مفای بیت وخودایێ مەزن ژ مە هەمییان قەبویل بکەت, وبتایبەت یێن کو هاریکاریا مە کرین بۆ تمام کرنا ڤێ پەرتوکا ب مفا.

شیڤان شێخەمیری

عاشورا 1444

# پێشەکییا نڤیسەری

حەمد و سوپاسی بۆ خودایێ هەمی جیهانێ، خودانێ هەمی مولکی، خودانێ عەرشێ مەزن، ئەوێ کو ئەم پاشڤە لێداین ژ کرێتی و گونەهـ و خرابییا بێ خێر، ئەوێ فەرمانا مە ب دەهمەن پاقژی و ستارەکرنێ کری ل هەمی گاڤ و دەمەکی، صەلات و سەلام ل سەر باشترین هنارتی بن ــموحەممەدیــ و ل سەر مالبات و هەڤال و هوگرێن ئەوی و هەمییان.

و پاشی:

من دەستپێکر ب ناڤێ خودایێ هەمی جیهانێ بۆ دیارکرن و ڕۆنکرنا هندەک کاروبارێن گرێدای حیجابا ئیسلامی یا دروست، وەکو کا چاوا خودێ و پێغەمبەرێ ئەوی ژخودان باوەرێن چاک خواستی، ئەڤە ژی ژبەر ئەوێ چەندێ کو من تێبینی کر گەلەک ژ خوشکێن مە یێن خودان حیجاب (حیجاب) و خودان باوەر، ئەو ب دروستی د مەرجێن حیجابا دروست نەگەهشتینە و نەزانییە ئەو مەرجێن کو خودێ فەرمان پێ ل ئەوان کری و سوننەتا پێغەمبەرێ وی ب ڕۆن و ئاشکەرایی دیارکری، من هیڤییە ژ خودێ کو ئەو خەلات و پاداشتێ ئەڤی کاری بدەتە من، هەروەسا دوعا بکەن بۆ بەندەیێ خودێ یێ هەژار.

خزمەتکارێ پەرتووکا خودێ و سوننەتا پێغەمبەریﷺ

أبو عبدالله ليث الحيالي

## پێدڤیـــــــــــــــــەک

پێدڤیەکا پێدڤی ژبۆ هندێ خواندەڤان ل چ پەیڤان گوهوشی نەمینیت، ژبەر هەر پەیڤەکا بۆ خواندەڤانی یا نوی بیت، فەرهەنگەک بۆ ئەڤێ پەرتووکێ هاتییە بەرهەڤکرن:

| کوردی | عربی |
|---|---|
| 1. حیجابا دروست | حیجاب الشرعی |
| 2. دووڕیاتی | نیفاق |
| 3. بێ ستارەیی | تبرج |
| 4. پێچ | نیقاب |
| 5. بێ شەرم، بەرهلا | فاسق |
| 6. سەرکار | ولی الامر |
| 7. مەهدەر | شفاعة |
| 8. توخیب | احکام |
| 9. پاقژی | عفة |
| 10. دلینی | عاطفة |
| 11. سوز | بیعة |
| 12. گومان | شبهة |
| 13. ئەو کەسێن ل مرۆڤی نەهێنە مارەکرن (باب، برا، باپیر، خارزا، خال...هتد.) | محارم |

## ئەو ئایەتێن ل دۆر حیجابێ هاتین

بسم الله الرحمن الرحيم

١. (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ. وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) **(1)**

٢. (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) **(2)**

٣. (وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ)**(3)**

٤. (وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)**(4)**

٥. (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)**(5)**

---

(1) الاحزاب: ٥٩
(2) النور: ٣١
(3) الاحزاب: ٣٣
(4) النور: ٣١
(5) الاحزاب: ٥٣

**ئایەتا ئێکێ:**

**(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) [(1)]**

ئانکو: (ئەی پێغەمبەر تو بێژە ژنکێن خۆ و کچێن خۆ و ژنکێن خودان باوەران: بلا ئەو پێچێن خۆ ب سە ر سەرێ خۆ و دێمێ خۆدا بەردەن؛ دا سەر و دێم و بەرسنگێن خۆ ڤەشێرن؛ چونکی ئەڤ چەندە نێزکیترە کو ئەو ب ستارەییێ بهێنە نیاسین و دا ئەو بەرهنگاری چ نەخوشی و ئێشانان نەبن. و خودێ گونەهـ ژێبرێ دلوڤانکار بوویە کو وی گونەهێن بووری بۆ هەوە ژێ برین و ب دیارکرنا حەلالی و حەرامی دلوڤانی ب هەوە بری)[تەفسیرا ب ساناهی]

**شروڤەکرن:**

**گۆتنا خودێ: (مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ) ئانکو: کۆمکرنا ناڤێ جلبابیە و ئەو جلکەکێ فرەهترە ژ خیمارێ.**

ژ کیسێ ئبن عەباس و ئبن مەسعودی خودێ ژ وان ڕازیبیت دبێژن: (أنه الرداء) ئانکو: ئەو جلکێ دروستە یێ کو ژ حەفکا مرۆڤی هەتا نافکا مرۆڤی دبێژنێ: (الرداء) و هندەک ژی دبێژنێ: قیناع.

و یا دروست ئەوە کو جلباب: ئەو جلکەیە یێ کو هەمی لەشێ مرۆڤی ڤەدگریت، ئانکو: ستارە بکەت.

---

([1]) الاحزاب: ٥٩

ژ ئوم عەطییە ـخودێ ژێ رازیبیت ـ گۆت: (من گۆتە پێغەمبەری ﷺ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چێدبیت هندەک جارا مە جلباب نەبیت بۆ نموونە: بۆ نفێژا جەژنێ، یان کۆمبوونەکێ ل ئەوی دەمی چ بکەین؟ گوت: بلا ل دەڤ خوشکا خۆ بینیت یان ل دەڤ هە ڤالەکێ)[1]

ئیمامێ طەبەری ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەت ـ دبێژیت: ژ ئبن عەباسی ـخودێ ژێ رازیبیت ـ گۆتنا خودێ: (**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ**) خودێ فەرمانا ژنکێن خودان باوەرانکر کو ئەگەر ژ مالێن خۆ دەرکەڤن بۆ پێدڤییەکا خۆ بلا ئەو نافچاڤێن خۆ ڤەشێرن و چاڤەکێ خۆ ب تنێ دیار بکەن[2].

ئوم سەلەمە ـخودێ ژێ رازیبیت ـ دبیژیت: دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خارێ (**يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ**) ژنکێن ئەنصاری (پشتەڤان) دەرکەڤتن ژ مالێن خۆ هەر وەکو قەل ل سەر سەرێ ئەوان (قەل ئانکو: بالندێن رەش)[3]

د ئەڤێ فەرموودێدا سالوخەتەکێ هویر یێ هەی بۆ ئەوێ حیجابێ یاکو خودێ فەرمان پێ کری، نە وەکو حیجابا ژنکێن ئەڤی سەردەمی.

شێخێ ئیسلامی ئبن تەیمییە ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەت ـ دبێژیت:

جلباب ئانکو: (الملاءة) ئەو، ئەوە یێ کو ئبن مەسعودی ـخودێ ژێ رازیبیت ـ و غەیری وی ناڤکری ب (رداء) و خەلکێ گشتی دبێژنێ: (ئیزار)،

---

([1]) البخاري (٣٥١)، و مسلم بلفظه ٨٩٠ (١٢)
([2]) (تفسير الطبرى/٢٢/٤٦))
([3]) رواه ابو داود (٤١٠١)

ئیزار ئەو جلكێ بەرفرەهە یێ كو ژ سەرێ ئەوێ و هەمی لەشی ڤەدگریت.
ئەبو عوبەیدە دبێژیت: ئەو جلكە یێ كو ب سەر سەرێ خۆدا بەردەت و هەمی لەشی ڤەدگریت و چ ژێ دیار نابیت ب تنێ چاڤەک و پێچ (نیقاب) ژێ دكەڤتیە ل بنڤە)[1]

الملاءة:- ئەو جلكێ ئێک پارچەیە ل دۆر مرۆڤی دزڤریت (ئانكو: هەر ژ سەری هەتا بنی ئێک پارچەیە)، هندەک ژێ دبێژنێ: (الرداء) وەک: ئبن مسعودی و خەلک ب گشتی ژێ دبێژنێ: (الازار).

ئیزار:- یان ژی (الملاءة) ئەو جلكەیە كو لەشێ مرۆڤی هەمیێ ڤەدگریت، ئانكو: ستارە دكەت ژ سەری هەتا بنی.

ڤێجا ل ڤێرێ بۆ مە دیاردبیت كو خودێ چەند ژنک یێن هاندایین بۆ جلكێ فرەهـ و درێژ، ئەو جلكێ كو جهێ جوانییا ژنكێ دەرنەئێخیت و ئەوێ تشتی دەرنەئێخیت ئەو نەبیت یێ خودێ رێک پێ دای بدەرێخیت. بۆ نموونە: هەردوو دەست و ناڤچاڤ ئەوژی بۆ (ئەوان كەسێن ل مرۆڤی نەهێنە مارەكرن) ئانكو: (مەحارما) ، یان ژی بۆ نڤێژێ یان ل دەمێ طەوافێ ل دۆر كەعبێ دروستە سەروچاڤ دیاربن.

هەرووسا بەلگە تێدایە ل سەر ل بەرخۆكرنا خیمارێ ئەو خیمارا كو گەلەک ژن ژێ د غافل و بێ ئاگەهن.

بەلێ نوكە؛ ئەڤ ئایەتە ل دەڤ هندەک كچێن حیجاب یا ژ كارئێخستییە، ئەگەر ئەڤی مەرجی ئەم ل سەر خوشكێن خۆ یێن ئەڤرۆ یێن موسلمان و خودان دەرسووک بجهـ بینین دێ تشتێن سەیر بینین!

---

([1]) مجموع الفتاوى (١١٠،١١١/٢٢)

دێ بینین هندەک ژنکێن حیجاب هندەک جلکێن کورت و ڕەنگا و ڕەنگ یێ ل بەر، د هەمان دەمدا دێ دەرسووکێ کەتێ و دێ بێژیت: ئەز یا ب حیجابم!

ئەرێ ئەڤە چ حیجابە یا هوسا؟

ئەرێ ما تە دڤێت تو جوانییا خۆ ڤەشێری یان ژی بۆ خەلکی پێش چاڤ بکەی؟

ئەی خوشکا من: ئەڤ بێ سەروبەری و بێ ستارەییا د جلکاندا ئەڤە نە یا دروستە ئەگەر تو نەزانی، ئەڤ جلکێن کورت دبنە جهێ فتنێ بۆ کوڕکا و پتر سەرنجا وان بۆ خۆ ڕادکێشیت ل سەر هندێ ڕا تو دبێژی من حیجاب یا ل بەر خۆ کری!

هەروەکو من تێبینی کری کو هندەک کچ و ژن دێ هندەک شەقا و فەتحا ل تەنوورێن خۆ کەن ل ڕەخێ ڕاستێ و ڕەخێ چەپێ، ئەڤ شەقە تشتەکی زێدە ناکەن ژبلی هندێ کو پتر گەنجی د فتنە ببەن، چونکی ئەڤە دبیتە جهێ سەرنج ڕاکێشانێ بۆ ئەوان، هندەک جارا یا ژ ئەڤێ خرابتر دێ بینی ئەو ژی ئەوە کو هندەک کچ پەنتەڕۆنی ل بەر خۆ دکەن!

ب ڕاستی ئەز نزانم تو چاوا دەرسووکێ ل گەل پەنتەڕۆنی ل بەر خۆ دکەی؟ ئەرێ ئەی خوشکا من تە هزرا خو د مەسەلێدا کرییە کا چەند نە یا گونجایە کچ پەنتەڕۆن و دەرسووکێ پێکڤە ل بەر خۆ بکەت؟

دیسان تو هزرا خۆ بکە کو ڕۆژا قیامەتێ کەربڤەبوونا خودێ یا ل سەر تە ژبەر ئەڤێ پەنتەڕۆنی و هەر تشتەکێ وەکو وی و تو یا ل بەرامبەر خودایێ خودان هێز و شیان (عززەت)!

ڤێجا تو هشیاری ئەڤێ چەندێ بە، چونکی ئەڤە چاڤلێکرنا ژنکایە ب زەلامان و پێغەمبەری ﷺ پاشڤەلێدان یا ژ ئەڤێ چەندێ کری، چونکی دەما ژن خۆ وەکو زەلامان لی دکەت بێ بەهر دبیت ژ بەهەشتێ (هەروەسا زەلام ژی دەما خۆ وەکو ژنکا لێ دکەت)، هەروەکو پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گوتی: **(ثلاث لا يدخلون الجنة ولا ينظر الله اليهم يوم القيامة العاقّ والديه، والمرأة المترجلة، والمتشبه بالرجال، والديوث)**[1]

ئانکو: (سێ کەس ناچنە بەهەشتێ و ڕۆژا قیامەتێ خودێ ب چاڤێ دلۆڤانییێ بەرێ خۆ نادەتێ، ئەوێ خراب بیت د دەرهەقا دەیک و بابێن خۆدا و ئەو ژنکا خۆ وەکو زەلامان لێ بکەت و ئەو زەلامێ غیرەت ل سەر مالا خۆ نەبیت).

ژ ئەبی هورەیرە _خودی ژێ رازی بیت_ گۆت: **(لعن رسول الله الرجل يلبسن لبسة المراة والمرأة تلبس لبسة الرجل)**[2]

ئانکو: (پێغەمبەرێ خودێ ﷺ لەعنەت یێ ل ئەوی زەلامی کرین یێ جلکێ ژنکێ بکەتە بەرخۆ و ئەوێ ژنکی یا جلکێ زەلامی بکەتە بەرخۆ).

ئەم یێ بەرەڤ ڕەوشەکا خرابڤە دچین، ژبەر وێ ئەوا ئەم ئەڤرۆ ژ خوشکێن خۆ یێن حیجاب دبینین، ل زانکۆ و بازار و ل سەر ڕێکێن گشتی، ئەو جهێن کو جۆرێن تێکەلییێ لێ هەین د ناڤبەرا کوڕ و کچاندا، دێ بینین خودانێن دەرسووکا جلکەکێ وەسا یێ تەنک یێ ل بەر کو لەشێ ئەوێ یێ د

---

(1) اخرجه النسائی فی الكبرى (٣٥٧/١) واحمد(٦١٨٠)
(2) رواه ابو داود (٤٠٩٨)، واحمد (٨٣٠٩)

بندا دیار دبیت، هند یێ تەنگە کو مرۆڤ دشێت وەسفا قەبارێ لەشێ ئەوێ بکەت. خودایێ مەزنە دبێژیت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ [1]

ئانکو: (و هندی ژ ئەوان بێهت بلا ئەو جوانییا خۆ ڤەشێرن ئەو جلک تێ نەبن یێن ئەو ب سەر جلکان دا دکەنە بەر خۆ، ئەگەر چ فتنە ژێ چێ نەبن) ڤێجا ئەز نزانم چاوا ئەو هزر دکەت کو ئەو حیجاب، حیجابە و ئەوێ حیجابێ جهێ جوانییا وێ و لەشێ وێ نەڤەشارتییە ژ کورێن بیانی (کورێن بیانی مەرەم ژێ ئەوە کو نە مەحرەمێن وێنە) ئەرێ ما تە دینێ خودێ کرییە یاری بو خۆ؟! ئەرێ ما نەفسێن هەوە ل بەر هەوە سڤک بووینە و دینێ هەوە ل بەر هەوە سڤک بوویە؟! ئەرێ ما دێ کار ب دینی ژێ بەرزەکەن پشتی کو هەوە بیروباوەرێن دینێ خۆ بەرزە کرین؟!

ل ئەڤێ دووماهییێ ب تایبەت د کاودانێن بەرتەنگدا، ئەم تێبینی دکەین هندەک ژن جلکێ ناڤودەنگییێ دکەنێ، دێ بینین جوانترین جلک یێ ل بەر خۆ کری ل گەل نویترین مۆدێلدا کو د ناڤ کچ و ژنکاندا پێ ب ناڤودەنگ بیت، دێ زەلامێ خۆ یان باب یان دەیکا خۆ نەچار کەت کو ئەڤی جلکێ گرانبها بۆ بکرن، بۆچی ئەڤ چەندە ئەی خوشکا من یا ب حیجاب؟ نێ ئەڤە دبیتە دەستبەردان ژبلی هندێ کو کەربڤەبوونا خودێ یا د ئەڤێ چەندێدا، پێغەمبەرێ خودێ ﷺ یا گۆتی: (مَن لَبِسَ ثوبَ شُهرةٍ في الدُّنيا، ألْبَسَهُ اللهُ ثوبَ مَذلَّةٍ يومَ القيامةِ) [2]

---

(1) (النور: ٣١)

(2) رواه ابو داود (٤٠٢٩)، والنسائی (٤٦٠/٥)، وابن ماجه (٣٦٠٦) واحمد (٩٢/٢)

ئانكو: (هەچییێ جلكێ ناڤودەنگییێ بكەتێ د دونیاییێدا، ل ڕۆژا قیامەتێ خودێ تەعالا دێ جلكێ سەرشوورییێ ل بەر كەت).

(جلكێ ناڤودەنگییێ ل ڤێرێ ئەوە: ئەوێ چ جلك وەكو وی نەبن، بەلێ ئەو جلكێ كو یێ گران بیت و چ فتنە ژێ چێنەبن ئەو دروستە).

ئەی خوشكا موسلمان تو یا هشیاربە، هندی تۆڕێن ڕاگەهاندنێ نە د بوارێ ڕۆژنامەگەری، ڕادیۆ، تەلەفزیون و شانوو یێدا سەركەفتن ئینا د ژەهركرنا هزرا كەسێ موسلمان د مللەتێ ئیسلامێدا، وەلێكرن كو ل دویڤ ئەڤان گازیێن بەرزە بچن ئەوێن كو د پشت را دەزگەهێن صەهیونی دەست ل گەل هەی، دەستەكێن ڕۆژئاڤا ئەوێن كو عەقل نقووم كرین و هاڤێتینە د ناڤ مەزبەلەیێن میكروب و پەتا و ئێشاندا، ئەوێن كو شارستانییێن ماددی دروستكرین ب ناڤێ پێشكەڤتن و ڕەوشەنبیرییێ!

ئەڤجا دا بەحسا یا خرابتر بكەین ژ ڤێ، ئەوژی ئەوە دانانا مكیاجی، ب خوداكرنا گولاڤێ، بۆیاخكرنا نینوكان و هەر تشتەكێ دی ژ ئەوان تشتێن نە ژهەژی بۆ كچا موسلمان و خودان حیجاب، تو دێ بینی ئەوان ناڤچاڤێن خۆ یێن خەملاندین ب مكیاج و بۆیاخا كو نیزیكە عەقلا پێ ب فڕینن، د هەمان دەمدا دەرسووك ژی یا ل بەرا!

ب ڕاستی ئەز نزانم ئەڤە چ حیجابە ب ئەڤی شێوەی؟ نزانم حیجاب بۆ ڤەشارتنا جوانییێ یە یان ژی بۆ دیاركرنا جوانییێ یە؟

بۆچی ژن خۆ د ڕاپێچیت؟

ئەرێ تو خۆ د حیجابێ دا خودێ ژ خۆ ڕازی بكەی یان ژی تو وەل خۆ دكەی دا جوانتر لێ بهێیێ ل بەر چاڤێن خەلكی؟

ئەرێ ژ ڕاست ئەو خۆ د حیجابن ژبەر گوهداریکرنا خودێ یان ژی چونکی حیجاب یا بوویە مۆدێل؟

ئەی خوشکا موسلمان، هندی بێ ستارەییە ژ سوننەتا ئبلیسییە ڤێجا هشیاربە، هەما ئارمانجا سەرەکی یا ئبلیسی ئەوە ئەو جلکێ ستارەییێ ژبەر تە بکەت وەکو خودایێ مەزن کەرەم دکەت و دبێژیت:

(يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَـٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡآتِهِمَا)[1]

ئانکو: (ئەی دووندەها ئادەمی بلا شەیتان هەوە نەخاپینیت و گونەهێ ل بەر هەوە شرین نەکەت، هەر وەکو ئەوی ل بەر دایبابێن هەوە ئادەم و حەووایێ شرینکری، ڤێجا ژخبەر هندێ وی ئەو هەردوو ژ بەحەشتێ دەرێخستن، ئەو وان جلکێن خودێ ئەو پێ ستارەکرین ژبەر وان دکەت؛ دا عەورەتێ وان نیشا وان بدەت)

ڤێجا ئەی خوشکا من تو ل دویڤ پێنگاڤێن شەیطانی نەکەڤە هندی شەیطانە ئەو بوو مە دوژمنەکێ ئاشکەرایە، تو بزانە کو پێشکەڤتن نە ئەوە تو ناڤچاڤێن خۆ بۆیاخ بکەی و نە ژی ئەوە تو جهێ جوانییا خۆ دەربێخی و پێش چاڤ بکەی، بەلکو ب تەمامی بابەت پێچەوانەیە، تو سەحکە ڕۆژئاڤایێ چاوا ب تەمامی ڕەوشتێ ئەوان ژناڤچوو و دەرد و ئێش د ناڤ واندا پەیدا بوون.

بەلێ دەما ئەوان دینێ ئیسلامێ زانی و نیاسی و حیجابا دروست کریێ ئەوان هەست ب ئارامییێ کر، ئەڤە موسلمانەکا ئەمریکییە ناڤێ ئەوێ

[1] (الاعراف: ٢٧)

(ئامینایە) دەما ئەو موسلمان بووی وێ گۆت: ژ وێ ڕۆژا من حیجابا ئیسلامی گرێدای هنگێ ب دروستی من هەست ب بەرپرسیارەتییێ کر، ڤێجا ئەز بەرپرسم ژ ئەوی کارێ من زانی و لێگەریانا ئەوی تشتێ هێژ من نەزانی. ئەز داخاز ژ ئەوان کەسان دکەم یێن کو ڤان دیمەنان دبینن ئەو فەرمانا ب باشییێ و پاشڤەلێدانا ژ خرابییێ بکەن ب ڕێکەکا باش و قەنج و ب گۆتنێن خۆش و جوان، هەروەکو خودایێ مەزن گۆتی: **(وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡض يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ)** [1]

ئانکو: (و خودان باوەرێن مێر و خودان باوەرێن ژن هندەک ژ وان پشتەڤانێن هندەکانە، فەرمانێ ب باوەرییێ و کارێ چاک ل مرۆڤان دکەن و وان ژ کوفرێ و گونەهان ددەنە پاش)

---

([1]) (التوبة: ٧١)

**ئایەتا دوویێ:**

**(وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ)**

**شروڤەکرن:**

ئبن کەثیر ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەتـ دبێژیت: (الخمر: کۆمکرنا ناڤێ خیمارێ یە و ئەو، ئەوە یا کو کچ و ژن سەرێ خۆ پێ د ڤەشێرن، ئەوە یا کو خەلک دبێژنی: (المقانع) سەعیدێ کورێ جوبەیری ـخودێ ژی رازی بیتـ دبێژیت: **(وَلْيَضْرِبْنَ)** ئانکو بلا ب شدینن، بلا خیمارا خۆ ب سەر سەر و ستو و سنگێ خۆدا بەردەن و چ ژێ دیار نەبیت) [1]

ژعائیشایێ ـخودێ ژێ رازی بیتـ دبێژیت: (خودێ دلوڤانییێ ب ژنێت مشەختیبا ببەت ل دەستپێکێ دەما ئەڤ ئایەتە **(وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّعَلَى جُيُوبِهِنَّ)** هاتییە خار ئەوان دەهمەنێن خۆ برین و دانانە سەر سەرێ خۆ) [2]

و حافظ ئبن حەجەر ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەتـ دبێژت: (**(فَاخْتَمَرْنَ)** ئانکو: ناڤچاڤێن خۆ پێ ڤەشیریت) [3]

ئەڤە بەلگەیە ل سەر هندێ کو کچ و ژن خیمارێ ل بەر خۆ بکەن د جلکێ دروستدا کو گەلەک ژ ژنکێن ئەڤێ سەر دەمی ژێ د بێ ئاگەهن.

ڤێجا خوزی خوشکێن مە ئاگەهـ ژ ئەڤێ مەسەلێ هەبا ئەو مەسەلا کو کچ و ژن ژێ بێ ئاگەهـ بووین د حیجابێدا.

---

[1] تفسیر ابن کثیر ج٣، ص٢٨٥
[2] رواه البخاری (٤٧٥٨)، ابو داود (٤١٠٢)
[3] فتح الباری ج٨: ص٣

**بۆچی خوشکا موسلمان؟**

سەحکەیێ، خودێ چ ژتە دڤێت؟ ستارەکرنا سینگی دڤێت، هوین ب خودێ کەن خوشکێن من یێن موسلمان چەند مە دیتینە ژ کچ و ژنان ب حیجابن و سینگێ ئەوان بەشەک ژێ یێ دیارە (والعیاذ بالله)، ئەم دبینین تەنوورێت درێژ د کەنێ و شەق (فە تحە) یێن ل بەر و رەخ و پشتێن ئەوان، ڤێجا خۆ و زەلامان د فیتنە دبەن، ئەو نزانن کو ئەڤ شەقە سەرنجا گەنجان پتر دکێشیت ژ جلکەکێ دی.

نزانم دە مێ کچ کراسەکێ وەسا دکەتێ کو سینگێ ئەوێ یێ دیار، ئەو د رێکاندا دچیت و ل ناڤ دیوانان دروینیت یان ل باخچەکێ د ناڤ زەلام و گەنجاندا، تو چ دبێژی؟

ئەرێ تو بێژی ئەو ئازادیا خۆ دیار دکەت؟

ئەرێ ژ راست ئازادییە هیڤی و ئارمانجا ئەوێ...؟

ئەڤ گە نجێ نەخۆش (سەردا چووی ) یێ کو سینگێ ئەوێ ئەو ئازراندی و ب بەرێخودانەکا دژوار سەحدکەتێ؟

ئەرێ ما نزانیت سینگێ ئەوێ یێ رویس پتر شەهوەتا کورکا د ئازرینیت؟

ئەرێ ئەوێ ئەڤ فیستانێ هەتکبەر بۆ خۆ کرییێ یان بۆ ئەڤان گەنجان؟

ئەوێ ئەڤ کارە کریە دا خەلکەک بەرێ خۆ بدەنێ؟

یان ئەو دناڤ دلچوونێن خۆدا نقووم بوویە؟

ئەڤ پرسیارە هە می من ئاراستەی ئەوان کرن یێن خودێ ژبیرکرین و خودێ بە حسێ وان دکەت دبێژیت: (وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوااللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُولَـٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) [1]

ئانکو: (هوین گە لی خودان باوەران وەکو وان نەبن یێن حەقی هێلاین یێ خودێ ل سەر وان کری ئەرک ڤێجا ژبەر هندێ وی بارا وان هێلا ژ وان خێرێت وان ژ عەزابا ڕۆژاقیامەتێ ڕزگار دکەت ژبیرا وان بر، ئەوێن هەنە یێن فاسق، یێت کو ژبن فەرمانا خودێ و پێغەمبەرێ وی دەرکەڤتین).

**خوشکا خودان باوەر:**

دەما تو شەریعەتێ خودایێ مەزن بجهـ دئینی ب لبەر خۆ کرنا جلکێ ئیسلامی یێ دروست یا فەرە دەما کو تو دچییە بازاری و بۆ خۆ جلکا د کری تو یا ڕژدبی ل سەر هندێ کو ئەو جلکە بیت یێ خودایێ مەزن بڤێت نە کو ئەو جلک بیت یێ خەلکی دڤێت.

---

([1]) سورةالحشر: ١٩

## هندەك مەرج كو پێدڤییە ل بیرا تە بن دەما تو بۆ خۆ جلكان دكری

١ــ دڤێت جلک یێ درێژ بیت و لەشێ کچێ هەمییێ بگریت و ڤەشێریت ژ چاڤێن ئەوان زەلامێن کو نەبنە ژ مەحرەمێن وێ.

(ئەڤە پێچەوانەی ئەوان جلکایە یێن کو هندەک ژ کچێن موسلمانان دکەنێ، دەما کو پیێن ئەوان دەردکەڤن و ئەڤە ناچێبیت، ئەگەر وەکر ل ئەوی دەمی ناهێتە هژمارتن کچا ب حیجاب).

٢ــ نابیت یێ تەنک بیت (ئانکو: شەفاف) کو لەشێ ئەوێ د بندا دیار ببیت(بەلێ ئەڤرۆ! دێ بینی کچا ب حیجاب جلکێن تەنک دکەتێ، ئەڤە نە یا دروستە (حەرامە) و پێچەوانەی جلکێ دروستە (شەرعی).

٣ــ یێ تەنگ نەبیت (ئانکو: یێ شدیای) کو وەسفا ئەندامێن لەشێ ئەوێ بهێتە کرن.

پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دبێژیت: **(صنفان من أمتي لم أرهما بعد ، نساءٌ كاسياتٌ عارياتٌ مائلاتٌ مميلاتٌ ، على رؤوسِهن مثلُ أسنمةِ البختِ ، لا يدخلن الجنةَ ولا يجدن ريحَها)**

ئانکو: (دوو دەستەک ژ ئەهلێ ئاگری نە من نەدیتینە... هندەک ژنکن ب جلکن و هەروەکو ئەو د بێ جلک ...)

شێخێ ئیسلامێ (ئبن تەیمە) خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت دبێژیت: گۆتنا پێغەمبەری ﷺ (كاسيات عاريات) یا هاتییە تەفسیر کرن ب هندێ کو مرۆڤ ئەوی جلکی بکەتێ یێ مرۆڤی ستارە نەکەت، ڤێجا وێ جلکێ کرییێ بەلێ د ڕاستیدا یا بێ جلکە، وەکو وێ یا جلکەکێ تەنک ل بەر خۆ بکەت و لەشێ وێ تێدا دیار بکەت، یان جلکەکێ وەسا تەنگ بکەتێ کو مرۆڤ بشێت قەبارێ لەشێ وێ بزانیت یان هەر جلکەکێ وەسا، بەلکو جلکێ کچێ یێ ب

دروستی ئەوە یێ کو لەشێ وێ ستارە دکەت و قەبارێ لەشی وێ تێدا نەهێتە وەسفکرن و دیارکرن ژبەر فرەهیا وی)[1]

ئیمامێ نەوەوی _خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت_ دبێژیت: (کاسیات عاریات) ڕامانا وێ ئەوە کو هندەک ژ لەشێ خۆ بدەرێخیت داکو جوانیا ئەوێ دیار ببیت، ڤێجا هنگێ ئەو دهێنە هژمارتن کو جلک یێ ل بەر بەلێ د هەمان دەمدا ل بەر نینن، هاتییە گۆتن ئەون یێن کو: جلکەکێ تەنک ل بەر خۆ دکەن کو لەشی ئەوان د بندا دیار دکەت، ڤێجا هنگێ ئەڤە ڕامانا هندێ ددەت جلک یێ ل بەر و ل بەر نینن).

و هندی گۆتنا پێغەمبەری ﷺ (مائلات ممیلات): هاتییە گۆتن: ئەون یێن کو ژ گوهدانا خودێ هاتینە لادان و یێن دەهمەنا خۆ نە پارێزن، (ممیلات) غەیری خۆ ژی فێری هندێ دکەن، هاتییە گۆتن: (مائلات) ئەوێن ڕێڤەچوونا خۆ خاردکەن و خۆ مەزن دکەن، (ممیلات) ملێن خۆ د هەژینن و هاتییە گۆتن: مەیلا زەلامان بۆ خۆ ڕادکێشن ب جوانیا خۆ.

و (**رؤوسهن كأسنمة البخت**) ڕامانا ئەوێ: ئەو سەرێن خۆ مەزن دکەن ب خیمار و دەرسووکا خۆ، ژبلی ئەڤان ژی ژهەر تشتەکێ کو دکەنە گرێک هەتا سەرێ ئەوان وەکو پشتا حێشترێ لێ دهێت)[2]

٤_جلکێ ئەوێ وەکو یێ زەلامان نەبیت، پێغەمبەرێ خودێ ﷺ لەعنەت یێ ل ئەوان ژنکان کرین یێن خۆ وەکو زەلامان لێ دکەن، ڤێجا (پەنتەرۆن) ژی دکەڤیتە ل بن ئەڤی جۆرێ جلکاندا.

---

(1) مجموع الفتاوى لابن تيمية (١٤٦/٢٢)

(2) شرح النووي على صحيح مسلم (١٩١/١٧) باختصار

ژ ئبن عەباسی ـخودێ ژێ رازی بیتـ گۆت: **(لَعَنَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللّٰهُ عليه وسلَّمَ المُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بالنِّسَاءِ، والمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بالرِّجَالِ)**(1)

ئانكو: (پێغەمبەرێ خودێ ﷺ لەعنەت یێ ل ئەوان ژنکان کرین ئەوێن خۆ وەکو زەلامان لێ دکەن و ئەوان زەلامان یێن خۆ وەکو ژنکان لێ دکەن)

وەکو چاوا: (پێغەمبەرێ خودێ ﷺ لەعنەت ل ئەوی زەلامی کری یێ جلکێ ژنکا ل بەر خۆ بکەت و ئەوێ ژنکا جلکێ زەلاما ل بەر خۆ بکەت)(2)

ئیمامێ طەبەری ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەتـ دبێژیت: ئانکو ناچێبیت زەلام خۆ وەکو ژنکان لێ بکەت د جلکیدا، د خۆ جوان کرنێدا و د هەر تشتەکیدا کو گرێدای ژنکان بیت، هەروەسا پێچەوانە ژی ناچێبیت ژن ژی خۆ وەکو زەلامان لێ بکەت د هەر تشتەکیدا کو گرێدای زەلامان بیت)(3)

٥ـنابیت جلکێ ئەوێ وەکو جلکێ کافران بیت و مۆدێل و عەدەتێن وان، ژبەر گۆتنا پێغەمبەری ﷺ : **(من تشبَّهَ بقومٍ فَهوَ منْهم)**(4)

ئانکو: (هەچییێ خۆ وەکو مللەتەکی لێ بکەت هەما ئەو ژ وانە)

ئەوا ئەڤرۆ ئەم دبینین ژ چاڤلێکرنا کافران پرچا مرۆڤی سپی دکەت، وە لێ هات حیجاب هەما ب تنێ ببوو تشتەک ل سەر سەری و یا ڤالا ژهەمی رامانێن پاراستن و رەوشتی، هەروەکو حیجاب دیارکرنا جوانییێ نە کو ڤەشارتنا ئەوێ!

---

(1) البخاري: ٥٨٨٥
(2) ابو داود: ٤٠٩٨
(3) فتح الباري/(٣٤٥/١٠)
(4) ابو دادو: ٤٠٣١

٦_ جوانییەکا وەسا تێدا نەبیت کو چاڤان بۆ خۆ ب ڕاکێشیت دەما ئەو ژ مال دەردکەڤیت، ڤێجا چ ئەڤ ڕاکێشانە د جلکیدا یان ژی د ڕەنگێ جلکیدا بیت کو گەلەک یێ نەخشاندی و ڕەنگا و ڕەنگ بیت، داکو نەبیتە ژ ئەوان یێن خۆ بێ ستار(تبرج) دکەن ب جوانییێ.

ئیمامێ ئالوسی _خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت_ دبێژیت: (ل دەڤ من تشتەکێ دی ژی هەر ژ جوانییا نە دروستە یاکو کچ ژێ هاتینە پاشڤە لێدان ئەوژی ئەوە کو ئەو ژنکێن زەنگین یێن ل سەر دەمێ مە دەما ئەو ژ مال دەردکەڤن ئەو جلکەکی ب سەر جلکێ خۆدا دکەنە بەر خۆ و ئەو جلکە ژ حەریرییە (ئاڤرمیشی) و یێ ڕەنگا و ڕەنگە، هندەک نەخشێن ژ زێر و زیڤی یێ ل سەر کو چاڤێن مرۆڤی بۆ خۆ ڕادکێشن، ڤێجا ئەز دبینم ئەڤە ژ کێم غیرەتییا زەلامێن ئەوانە ل سەر وان، چونکی نابیت ئەو ژنک ب ئەڤی ڕەنگی دەرکەڤن ژ مالێن خۆ و ئاریشە یا مەزن بووی ب ئەڤێ چەنداهە)[1]

ئەگەر ئەم بەراوردییێ بکەین دناڤبەرا ئەڤان مەرجان ل گەل حیجابا ئەڤرۆ دێ تشتێن سەیر بینین، دێ بینین حیجابا ئەڤرۆ ب ڕەنگا یا هاتییە نەخشاندن، ئەڤە یا سورێ توخە، واهە یا پیڤازییێ چاڤ کێشە و یا ئێکا دی مۆرە دێ بێژی (عارضة الازياء)ــە نە کو حیجابا دروستە!

دێ بێژی کچێ دڤێت جلکێ خۆ پێش چاڤ بکەت دا خەلکەک ببینیت، ڤێجا دێ بینین پاتەکێ کرییە بەر خۆ سەرێ خۆ یێ پێ ڤەشارتی، هندەک ڕەنگ یێن تێدا یێن کو چاڤان پتر بۆ خۆ ڕادکێشن ژ پرچێ ئەوێ، ئانکو ئەگەر پرچا خۆ دەرێخستبا هند چاڤێن خەلکی بۆ خۆ نە ڕادکێشان،

---

([1]) روح المعاني للالوسي (١٤٦/١٨)

وەکو ئەڤان ڕەنگێن د ناڤ دەرسووکا ئەوێدا و ئەو مۆدێلێن ل دەرسووکا خۆ کرین، ئەم دبینین هەر ڕۆژ مودێلەکا دەرسووکێ یا بۆ مە دەردکەڤیت هەتا وەلێ هاتی ب ئەڤێ حیجابێ د فیتنە چووی، وەکو ئەوان (عەبایێن) ل ڤێ دووماهییێ بۆ مە دەرکەڤتین، ئەوێ یا ژبیرکری کو حیکمەت ژ حیجابێ ڤەشارتنا جوانییێ یە نە کو پێش چاڤکرنە، تشتێ سەیر ئەوە ئەم دبینین هندەک کچێن پێگیر ب دینێ خۆ یا ڕژدە ل سەر هندێ کو ب جوانترین جوانی ژ مال دەربکەڤیت خۆ دێ بێژی ئەوێ دڤێت خۆ پێش چاڤبکەت و بێژیتە خەلکی سەحکەنە من ئەز یا جوانم! یا ژبیرکری کو خودێ فەرمان یا کری جوانییا خۆ ڤەشێرن، (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) [1]

ئەرێ دێ حال چ بیت ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ ﷺ ژنکێن ئەڤرۆ دیتبان ئەوێن هەمی خەما ئەوان ئەوە کو جوان ژ مال دەربکەڤن؟ خۆ پتر بۆ خەلکی جوان دکەن ژ زەلامێن خۆ، ل سەر جادە و ڕێکان سەرەدەرییێ ب کەنی و سوحبەتڤە ل گەل دوکاندارا دکەن ب تنێ دا بهایێ تشتی بۆ ئەوان بینە خار و خودێ ژبیرکر، ڤێجا ل دەمێ خودێ ژبیرکری نەفسا خۆ ژی ژبیرکر هەتا بوویە ژ کەسێن بێ شەرم (فاسق).

ئەو زەلامێ ئەڤان کاران ژ ژنکا خۆ، خوشک و کچا خۆ دبینیت و غیرەت د ناخێ ئەویدا نە لڤیت و ئەوێ نە ڕاوەستینیت ل سنوورێن وێ، بەلکی یا خرابتر هندە جار ئەم دبینین هەما زەلام ب خۆ پشتەڤانییا ئەوان دکەن، ئەڤ زەلامێ ئێخسیر نزانیت کو ڕۆژا قیامەتێ دێ ستوییێ ئەوی گرن

---

[1] سورة النور: ٣١

و هاڤێژنە د ئاگریدا و خودایێ مەزن دێ وی سزادەت وەکو چاوا ژنک سزادای، چونکی زەلام بەرپرسە ژ ئەوان ژنکێن ل بن دەستێ وی وەکو: (ژن، کچ و خوشک) ل بەرامبەر خودێ، بلا نەبێژیت من چ پەیوەندی پێڤە نینە، بەلکو تو ئێکەم کەسی یێ پرسیار ژێ دهێتە کرن بەرامبەر خودێ.

تشتێ سەیر ئەم دبینین جلکێن تەنک یێن کو لەشێ ژنکێ تێدا دیاردبیت، ئەڤە ل گەل گەلەک کچ و ژنێن حیجاب یا پەیدابووی! ئەز نزانم تە دڤێت تو خۆ ب فروشییە خەلکی دەما کو تو ئەڤان جۆرێ جلکان دکەییێ یان ژی هەما چونکی ئەوێ خودێ ژبیرکرییە لەوا نەفسا خۆ ژی یا ژبیرکری، ڤێجا ژبەر هندێ یا بوویە ژ کەسێن بێ شەرم.

ژ هندەک ژنکێن موسلمانان دووڕیاتیێ د حیجابێدا بکاردهینن، ئەگەر د ناڤ هندەک کەساندا بن د پێگیرن ب حیجابا دروست ئەوژی ل گەل ئەوان دێ حیجابێ کەتێ، ژ خۆ ئەگەر چوو د ناڤ هندەکێن دیدا و ئەو پێگیر نەبن ب حیجابا دروست و حیجابێ ل بەر خۆ ناکەن هەما ئەوژی ناکەتێ، هندەکێن دی یێن هەین ئەگەر ل جهەکێ گشتی بیت دێ حیجابێ کەتێ و ئەگەر چوو جهەکێ بازرگانی یان نەخوشخانەکێ یان ل گەل خودانێ دروینگەها جلکان باخڤیت دێ ناڤچاڤ یان دەستێن خۆ دیارکەت، خۆ دێ بێژی ئەو یا ل دەڤ زەلامێ خۆ!

ڤێجا تو گوهێ خۆ بدێ کا (حفصة بنت سيرين) چ د گۆت: ئەو ژنەکا ب ناڤ سالڤە چووی بوو، ژ عاصم ئەحوەلی گۆت: ئەم د چووینە دەڤ حەفصە کچا سیرینی و ئەوێ حیجاب د کرێ و ناڤچاڤێن خۆ ژی د ڤەشارتن ڤێجا مە د گۆتێ: خودێ دلوڤانییێ ب تە ببەت، خودایێ مەزن دەربارەی ژنێن ب ناڤ سالڤە چووی دبێژیت: **﴿ٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖ﴾** ئانکو: (ئەو

پیرەژنێن ژبەر ژیێ خۆ یێ مەزن ڕوینشتین و دلێ خۆ نابەنە شویکرنێ و چ زەلام ژی دلێ خۆ نابەنێ، ئەڤان چ گونەهـ ل سەر نینە کو هندەکێ ژ جلکێن خۆ بدانن وەکو وی عەبایێ ب سەر جلکان دا دکەنە بەر خۆ، بێی خەمل و خێزەکێ ل بەر خۆ بکەن) ئەوێ د گۆت: و پشتی ڤێ خودایێ مەزن چ دبێژیت؟ خودایێ مەزن دبێژیت: ﴿وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّ﴾ ئانکو: (وئەگەر ئەڤی ژی بکەنە بەر خۆ -بۆ ستارەی و پاقژییێ- بۆ ئەوان چێترە) و ئەوێ د گۆت: ئەڤە بنەجهـ کرنا جلبابییە)[1]

ئەی خوشکا من یا ژبۆ خودێ:

بۆچی تو یا ڕژد نابی ل سەر جلبابێ خۆ...؟ بۆچی ئەڤ سەرپێچییێن شەرعی یێن کو ئەم د جلکێ تە دا دبینین؟ بۆچی ئەڤ جلکێن تەنک؟ بۆچی شەق د تەنوورەیدا؟ بۆچی هندەک ژ پرچێ تە دەردکەڤیت دەما تو دەرسووکێ دکەیێ؟ ئەرێ ژنکێن ڕۆژئاڤای تو دسەردا بری ب فتنێن خۆ یێن بێ شەرم؟ باوەر ژ من بکە ئەو هیڤییان دخازن بگەهنە ئەوێ پلەیێا مەزن یا کو تە هەی، ئەڤە موسلمانەکا بریطانییە (خەدیجە) پشتی کو موسلمان بووی گۆت: (من د ناڤ هەمی ئایناندا گەرییا من ئارمانجا خۆ نەدیت د ئیسلامێدا نەبیت و دەما من ئەڤ ڕاستیە دیتی هنگێ من ئیسلاما خۆ ڕاگەهاند)

ڤێجا ئەڤە ئەورووپی بوو و تو... ئەڤە تو ژ دایک بووی تو یا موسلمان، بەلێ تو چاڤ ل هونەرمەندێن بێ شەرم و خرابکار دکەی و سەح دکەیە ئەوان، ئەو دویرترین کەسن ژ خودێ، باوەر ژ من بکە ئەو یێ د بەرزەبوونەکا مەزن دا دژین، ئەڤە هونەرمەند (شادیە) یە پشتی کو تەوبەکری گۆت: (من

---

[1] السنن الكبرى للبيهقي (١٢٥٣٥)

دڤێت تام بکەمە ئیمانێ، نوکە ئەز هەست ب ئێمناهییا دروستی دکەم ل بەر سەیبەرا خودێ، ئەز یا نەفسا خۆ ئامادەدکەم بۆ ڕازیبوونا خودێ پشتی کو من گەلەک زۆرداری ل نەفسا خۆ کری).

ئەز یێ پشت ڕاستم کو تە ژی خێر و باشی بۆ نەفسا خۆ دڤێت، تە نەڤێت تو ژ کەسێن بێ ستارەبی بەلێ نەزانینا مرۆڤی و هەڤالینییا خرابان و دویڤچوونا هەوایێ نەفسێ مرۆڤی د ئێخیتە د ناڤ ئەوان کاراندا یێن خودێ کەرب ژێ ڤەدبن.

**ئایەتا سێێ:**

(وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَـٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ)

ئانكو: (وهوین د مالێن خۆدا ڕوینن و ئەگەر بۆ كارەكێ پێدڤی نەبیت ژ مالێن خۆ دەرنەكەڤن و هوین خەملا خۆ بەرچاڤ نەكەن، وەكو ل دەمێ جاهلیەتا بەری هاتنا ئیسلامێ ژنان دكر و وەكو گەلەك ژن ل ئەڤی دەمی ژی دكەن: كو خۆ ڕویس و ڕسوا دكەن و دهێنە بـەرچـاڤێن خەلكێ)

ل دەمێ خودایێ مەزن دبێژیت: " وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ " ئانكو: هوین د مالێن خۆدا ڕوینن، ئەگەر بۆ كارەكێ پێدڤی نەبیت ژ مالێن خۆ دەرنەكەڤن، ژ ئەوان پێدڤیێن دروست نڤێژا ل مزگەفتێ یە ب مەرجێن ئەوێ، هەروەكو پێغەمبەرﷺ دبێژیت: (لا تَمْنَعُوا إِمَاءَ الله مَسَاجِدَ الله، ولكن ليخرجن وهن تفلات)

ئانكو: (هوین ڕێگرییا ژنكان نەكەن ژ چوونا ئەوان بۆ مزگەفتان، بەلێ بلا ئەو دەركەڤن و جوانكارییا ل خۆ نەكەن (نموونە: ل خۆ كرنا گولاڤێ) د ریوایەتەكا دیدا دبێژیت: (وبیوتـهن خیر لهن) ئانكو: مالێن ئەوان بۆ وان باشترن[1].

ل دەمێ خودایێ مەزن دبێژیت: "وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى "

مجاهد دەربارەی تەفسیرا ئەڤێ ئایەتێ دبێژیت: (بێ ستارەییا جاهلیەتێ ئەو بۆ ژن ژ مال دەردكەڤت و د ناڤ زەلاماندا د چوو)[2]

---

(1) تفسیر ابن كثیر (٤٨٣/٣)
(2) تفسیر ابن كثیر (٤٨٣/٣)

قەتادە دبێژیت: "وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ "

(دەمێ ژن ژ مالێن خۆ دەرکەڤتبان د ڕێڤەچوونێدا ئەوان خۆ خار و نازدار دکرن و خودایێ مەزن ئەو ژ ئەڤێ چەندێ پاشڤەلێدان) [1]

مقاتلێ کوڕێ حیانی دبێژیت: "وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ "

(بێ ستارەی -تبرج-): ئەوە دەمێ دەرسووکێ دکەیە سەرێ خۆ و نەشدینی ) [2]

ئەی خوشکا موسلمان:

خودایێ مەزن فەرمانێ ل ژنکان دکەت ئەو ژ مالێن خۆ دەرنەکەڤن، ئەگەر بۆ کارەکێ پێدڤی نەبیت، ژبەرکو ژن شەرمینگەهە (عورة) ( ب ئەوێ ڕامانێ کو ژن دشێت توشی خرابیێ ببیت چ ئەو خرابی ژ لایێ زەلامان ڤەبیت یان هەر تشتەکێ دی)، پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: **(المرأة عورة فإذا خرجت استشرفها الشيطان،وأقرب ما تكون من رحمة ربها وهي في قعر بيتها)**[3]

ئانکو: هندیکە ژنە شەرمینگەهە، ل دەمێ ئەو ژ مال دەردکەڤیت شەیتان پێشوازییا ئەوێ دکەت، نێزیکترین جه کو ژن ژ ئەگەرێ ئەوێ نێزیکی دلوڤانیا خودایێ خۆ ببیت کونجا مالا وێیە)، بەلێ ئەڤرۆ ئەم دبینین خەما پتریا ژنان ئەوە کو ژ مالێن خۆ دەربکەڤن، ئەم دبینین ئەو چاڤەڕێ هندێ نە کو جەژنەک یان هەلکەڤتەک بهێت دا ژ مال بچن، هەتا جەژنێن

---

[1] تفسير ابن كثير (٤٨٣/٣)
[2] تفسير ابن كثير (٤٨٣/٣)
[3] رواه الترمذي وقال حسن صحيح غريب

نە موسلمانان ژی ژ ئەوان: جەژنا سەرێ سالێ، نەورۆزێ و گەلەک جەژنێن دی...

خودایێ مەزن دبێژیت: (وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ) دگەل ئەڤێ چەندێ ئەو بێ ئەمرییا خودێ دکەن و دەردکەڤن هەر دەمەکێ ئەوێ بڤێت، ب بێ ستارەی ژی کو خودێ ئەم ژ ئەڤێ چەندێ یێن داینە پاش ب گۆتنا ئەوی (ولا تبرجن تبرج الجاهلية الاولى) تشتێ ب خەم ئەوە ئەم پترییا ژنان دبینین ل جادەیان هەر وەکو زەلامان! بەلکو ئەم ژنان ل بازاڕ و جادەیان پتر دبینین ژ زەلامان، ل گەل بێ ستارییەکا زێدە، بۆچی ئەڤ یارییپێکرنە ب ئەوێ یاسایا خودێ دانای؟ بۆچی ئەڤ چەندە ژ ژنکێن موسلمان پەیدادبیت؟ بۆچی چاڤلێکرنا ڕۆژئاڤای د هەر تشتەکیدا؟

ئەڤە (ام حميد)ـــە خێزانا (ابي حميد الساعدي) خودێ ژێ رازی بیت، هاتە دەڤ پێغەمبەری ﷺ گۆتێ: (ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز حەزدکەم نڤێژێ ل گەل تە بکەم، پێغەمبەری گۆتێ: من دزانی تو حەزدکەی نڤێژێ ل گەل من بکەی، بەلێ نڤێژا تە ل مالا تە بۆ تە بخێرترە ژ نڤێژا تە ل ژووراتە، و نڤێژاتە ل ژووراتە بخێرترە بۆتە ژ نڤێژا تە ل مزگەفتا کولانا تە، نڤێژا تە ل مزگەفتا کولانا تە بخێرترە ژ نڤێژا تە ل مزگەفتا من، ئەڤێ ژنێ گۆت من فەرمانکر، مزگەفتەک بۆ هاتە ئاڤاکرن ل دووماهییا مالا ئەوێ ل جهەکێ تارِی، ل ئەوی جهی نڤێژێن خۆ دکرن هەتا چویە دیدارا خودایێ مەزن)[1]

**,**خۆزی ژنکێن ئەڤڕۆ گوهـ ل ئەڤان فەرموودا ببایە کو ئەو ل هەر دەمەکێ ل سەر ڕێکانن بەلکو هندەک ژ ئەوان پتر ژ زەلامان دەردکەڤن، هندەک ژن

---

([1]) رواه احمد (٢٧٠٩٠)

دەمێ ژ مالێن خۆ دەردکەڤن گولاڤێ ل خۆ دکەن نزانن ل خۆ کرنا گولاڤێ حەرامە بۆ ئەوان ل دەمێ دەرکەڤتنێ،

هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: (أيما امرأة استعطرت فمرت على قوم ليجدوا من ريحها فهي زانية)[1]

ئانکو: (هەر ژنەکا گۆلاڤێ ل خۆ بکەت و لبەر هندەک مرۆڤانرا ببوریت دا ئەو بێهنا ئەوێ بهەلکێشن گونەها وێ وەکو دەهمەنپیسەکێ یە (زانیەکێ)).

بەلکو ئێک پرسیارەکێ بکەت و بێژیت ئەڤە چ دەمارگیرییە؟ ئەز دێ بێژم، نەخێر خوشکا من یا موسلمان خودایێ مەزن ژ بلی خێروچاکیێ چ تشتێ دی بۆ مە نەڤێت ئەز ئەڤی وێنەی نێزیکتر لێدکەم بۆ تە، ئەم دزانین کو نەفس دلێ خۆ دبەتە ئەوی تشتێ ب دفنا خۆ بێهن دکەت ئەگەر ژنێ گولاڤ ل خۆکر شەهوەتا ئەوی کەسی زێدەدبیت ئەوێ بێهنێ دهەلکێشیت، بۆ نموونە: ل دەمێ ئەم بێهنا گۆشتێ قەلاندی دهەلکێشین دلێ مە دچیتێ، ئەڤ پەندە ل سەر هندێیە کو ژن گولاڤێ ل خۆ نەکەت هەتا زەلام ب فتنە نەچیت ژ ئەگەرێ ئەوێ، حاشا بۆ خۆدێ کو ئەو تشتەکی ژ مە بدەتە پاش و لبەرمە تەنگ بکەت، هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: (إن الله رفيق يحب الرفق في الأمر كله)[2]

ئانکو: (خۆدێ حەز ژ نەرماتیێ دکەت د هەمی کاراندا).

---

(1) رواه الترمذي (٤١٧٣)

(2) متفق عليه

**ئایەتا چواریێ:**

**(وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)**[1]

ئانكو: (و دەمێ ژن ب ڕێڤە دچن بلا پێن خۆ ل عەردی نەدەن دا دەنگێ خەملا ئەوان یا ڤەشارتی وەکو دەنگێ خلخالان نەهێتە گوهـ لێ بوون و هوین -گەلی خودان باوەران- بزڤرنە گوهدارییا خودایێ خۆ د ئەوی تشتیدا یێ وی فەرمان پێ ل هەوە کری ژ سالۆخەتێن جوان و ئەخلاقێ باش و ئەوان ئەخلاقان بهێلن یێن خەلکێ جاهلیەتێ دکرن ژ سالۆخەت و ئەخلاقێ بێ خێر؛ دا بەلکی هوین خێرا دنیایێ و ئاخرەتێ ب دەست خۆڤە بینن)[2]

تەفسیر:

گۆتنا خودێ: **(وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ...)**، د جاهلیەتێدا دەما ژن د ڕێکێدا دچوون و خلخال د پێن ئەواندا بوون دەنگ ژێ نە دهاتن، ڤێجا دا پێن خۆ ل عەردی دەن داکو دەنگ ژێ هاتبان و زەلام ل دویڤ دەنگێ ئەوان لێ د زڤرین، ڤێجا خودێ ژنکێن خودان باوەر ژ ئەڤێ چەندێ پاشڤە لێدان و هەر تشتەکێ وەکو ڤێ کو ئەگەر یێ ڤەشارتی بیت و لڤینەکا وەسا بکەت کو خەملا ئەوان یا ڤەشارتی دیارببیت و زەلام لێ ب زڤرن ئەو ژی د کەڤتە ل ژێر ئەڤێ پاشڤە لێدانێدا، ژبەر گۆتنا خودایێ مەزن: **(وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ ۚ)** ئانکو: (و دەمێ ژن ب ڕێڤە دچن بلا پێن خۆ ل عەردی نەدەن دا دەنگێ خەملا ئەوان یا ڤەشارتی وەکو دەنگێ خلخالان

---

([1]) النور: ٣١

([2]) تەفسیرا ساناهی

نەهێتە گوهـ لێ بوون)، هەروەسا ئەو یا پاشقەلێدایە ژ هندێ کو خۆ بهێن خۆش بکەت، گولاڤێ ب خۆدا بکەت، ژ مال دەربکەڤیت و ڤێجا زەلام ل دوور بێهنا ئەوێ بزڤرن)[1]

ڤێجا ئەڤ ئایەتە بەلگەیە کو نابیت ژن جوانییا خلخالا دیاربکەت، هەروەسا هەر خەملەکا دی یا ڤەشارتی، ژ ئەوان: بێهن خۆشی ئەوا کو بێهنا ئەوێ دچیت. ژ ئەبو هورەیرەی _خودێ ژێ رازی بیت_ گۆت: ژنەک گەهشتە دەڤ من و بێهنا گولاڤێ ژێ د چوو، ئەوی گۆتێ: ئەی عەبدا خودێ، ئەرێ تو ژ مزگەفتێ دهێی؟ ئەوێ گۆت: بەلێ، گۆتێ: و تە بهێن خۆشی ب خۆدا کرییە؟ ئەوێ گۆت: بەلێ، ئەبو هورەیرەی گۆت: من یا گوهـ ل خوشتڤییێ خۆ بووی (ابا القاسمی_ئانکو پێغەمبەری) ئەوی د گۆت: (نڤێژا وێ ژنێ ژێ ناهێتە قەبیلکرن یا خۆ بهێن خۆش بکەت و بهێتە ئەڤێ مزگەفتێ، هەتا ئەو نەچیت خۆ بشووت وەکو شویشتنا ژ جەنابەتێ)[2]

بەلێ ل ئەڤرۆ ئەم کچ و ژنان دبینین ب جوانترین کار و خەمل، ئەگەر ژ مال دەرکەڤت دێ مکیاجی دانیت و بێهنێت خۆش ب خۆدا کەت و ئەگەر حیجاب ل بەر خۆ کر بێی کو ئەو سەحکەتێ کا ئەرێ وەسا حیجاب ل بەر خۆ کرییە وەک خودێ دڤێت یان وەکو ئەوێ دڤێت؟

بەلێ ئەو ل دویڤ هەواییێ نەفسا خۆ دچیت دا بۆ خۆ بکەتە خوداوەندەک وەکو خودێ گۆتی: **(أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ)** [3] ئانکو: (ئەرێ ڤێجا تە -ئەی موحەممەد- ئەو کەس دیتیە یێ دلچوونا خۆ بۆ خۆ

---

(1) تفسیر ابن کثیر/(٣/٢٨٦)
(2) رواه ابو داود، ابن ماجه، احمد
(3) الجاثية: ٢٣

کرییە خوداوەند)؟ بەلێ، ئەو بۆ خۆ دلچوونێن خۆ دکەنە خوداوەند، ئەگەر وەسا نەبیت ڤێجا پا چاوا شروڤە بکەین کو ئەوا ژ مال دەربکەڤیت، خۆ خەملاند بیت، مکیاج دانابیت، بێهنێن خۆش ب خۆدا کربیت، بێهن ژێ بچیت و بێژیت: ئەزا ب حیجابم!، ڤێجا ما ئەڤە چ حیجابە یا وەسا ؟! ئەرێ تو نەفسا خۆ د خاپینی؟ یان تو خەلکێ د خاپینی؟ یان تو خودایێ خەلکێ د خاپینی ئەوێ هەمی تشتێ ڤەشارتی و ئاشکەرا دزانیت؟

سویند ب ئەوی خودایێ کو چ خودا ژبلی وی نینن، ئەز گەلەک ژنکا د نیاسم حیجابێ دکەنێ بۆ دووڕیاتی نە کو بۆ گوهداریکرن و بجهـ هینانا فەرمانا خودێ، بەلکو هەمی خەما ئەوان ئەوە ئەو ب جوانترین سەروبەر و خەمل ژ مال دەربکەڤن، خودێ ژن یێن پاشڤە لێداین کو ئەو جوانیا خۆ پێش چاڤبکەن دەما ژ مال دەردکەڤن، ڤێجا ئەز نزانم ئەو بۆچی بێ فەرمانییا خودێ دکەت؟ ئەرێ ما ئەو ژ خودێ ناترسیت ئەو خودایێ کو ئەو چێکری؟ ئەرێ ما ئەو ژ ئاگرێ جەهنەمێ ناترسیت؟ ئەرێ ما ئەو ناترسیت ژ ئامادەبوونا خۆ ل بەرامبەر خودێ؟ ئەرێ ما ئەو ناترسیت کو ئەو هەر و هەر بمینیتە د ئاگریدا ل ڕۆژا قیامەتێ؟ ئەرێ ما ئەو ناترسیت ژ کەرب ڤەبوونا خودێ؟

ئەڤ جوانییا ئەوێ بۆ ژدەرڤەی مال دێ وێ دویرکەت ژ چوونا بەهەشتێ، چونکی ئەوێ خۆ مەزن کر ل سەر خودێ و سەرپێچییا فەرمانا ئەوی کر، ڤێجا جهێ ئەوێ دێ بیتە ئاگر و ئەو چ پیسە جهێ لێ مانێ یە.

تشتەکێ دی ژێ یێ هەی: دێ هەوە لێ هشیارکەم، ئەو ژی: گورێن ژنکێ و ئەڤە یا گرنگە، چونکی گەلەک ژ ژنکێن موسلمانان یێن خودان حیجاب گورێ ل بەر خو ناکەن.

ڤێجا ئەی خوشکا موسلمان، تو گوهدارییا ئەڤێ فەرمووداپێغەمبەری بکە ﷺ : (هەچییێ جلکێ خومەزنکرنێ ل بەر خۆ بکەت ل ڕۆژا قیامەتێ

خودێ ب چاڤێ دلوڤانییێ بەرێ خۆ نادەتێ. ئوم سەلەمەیێ گۆت: ئەرێ پا ژنک چ ل دەهمەنێن خۆ بکەن؟ پێغەمبەری گۆت: (بلا بهوستەکێ درێژ بکەن) ، ئەوێ گۆت: ل ئەوی دەمی دێ پێن وێ دەرکەڤن، پێغەمبەری ﷺ گۆت: (بلا گەزەکێ درێژ بکەن و چێیێ دی ل سەر ئەڤێ زێدە نەکەن)[1]

ڤێجا تو بەرێ خۆ بدە گۆتنا ئوم سەلەمەیێ ـخودێ ژێ رازی بیتـ ئەی خوشکا موسلمان: (ل ئەوی دەمی دێ پێن وێ دەرکەڤن) ، ژبەر هندێ پێغەمبەری ﷺ گۆت: بلا گەزەکێ درێژ بکەن و چێیێ دی ل سەر ئەڤێ زێدە نەکەن) چونکی نابیت پێن ژنێ دەربکەڤن.

بەلێ ئەڤرۆ، دێ بینی کچا موسلمان مۆدێلا ژ دەرێخستنا پێن خۆ چێدکەت، دێ بینی خەنا ل پێن خۆ یا دای داکو خەلک ببینن و گورێ ژی ناکەتێ، هەر ئاگەهـ ژ فەرمانا خودێ نینە هەما تشتێ گرنگ ل دەڤ ئەوێ ئەوە خەلک وێ جوان ببینن، نە هەر هند بەلکو هندەک ژ ئەوان (دەقا) ل پێن خۆ دکەن داکو خەملا خو پێ دیاربکەن، پێغەمبەرێ خودێ ﷺ نەفرەت یێ ل ئەوان کرین یێن دەقا ل خۆ دکەن و ئەوان ژی یێن بۆ ئێکی چێدکەن.

ڤێجا ئەی خوشکا موسلمان: تە ئەمانەت بجهـ هینانا فەرمانا خودێ و پێغەمبەرێ وی ﷺ ل ئەوی دەمی دێ بییە ژ سەرفەراز و سەرکەڤتییان.

(1) ابو داود، والترمذي

**ئایەتا پێنجێ:**

**(وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)**[1]

ئانكو: (و ئەگەر هەوە پسيارا تشتەكی ژ ژنكێن پێغەمبەری ﷺ كر هوين ل پشت پەردەيەكی پسيارێ ژێ بكەن؛ چونكی ئەو بۆ دلێن هەوە و بۆ دلێن ئەوان ژی پاقژترە ژ وان هزرێن دكەڤنە سەر دلێن ژنكان و زەلامان)[2]

ئیمامی طەبەری ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەت ـ دبێژیت: **(وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ)** دبێژیت: ئەگەر هەوە پرسيارا تشتەكێ ژ هەڤژينێن پێغەمبەری ﷺ كر و ژنكێن خودان باوەران ئەوێن كو نە هەڤژينێن هەوە **(فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ)** دبێژيت: ل پشت ستارەكێ (پەردەكێ) ژێ بكەن كو بكەڤيتە د ناڤبەرا هەوە و ئەواندا و هوين نەچنە د مالێن ئەواندا، **(ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)** خودێ دبێژيت: پرسياركرنا هەوە بۆ وان ئەگەر هەوە پرسيار كر ل پشت پەرەدەكێ ئەو بۆ دلێن هەوە و دلێن وان پاقژترە ژبەر ئەوان هزرێن دهێنە سەر دلێ زەلامان ژ مەسەلێن ژنكان و ئەوان هزرێن دكەڤنە سەر دلێ ژنكان ژ مەسەلێن زەلامان و نێزيكترە بۆ هندێ كو شەيطان ڕێكا خۆ ل دەڤ هەوە و ل دەڤ ئەوان نەبينيت)[3]

ئیمامێ قورطوبی ـخودێ دلوڤانییێ پێ ببەت ـ دبێژيت: (د ئەڤێ ئايەتێدا بەلگە هەيە كو خودێ دەستويری يا دای پرسيار ژ ئەوان بهێنە كرن

---

[1] الاحزاب: ٥٣
[2] تەفسيرا ساناهی
[3] تفسير الطبري/(٢٠/٣١٣)

ل پشت پەردێ ئەگەر پێدڤیکر، یان مەسەلەکێ کو فەتوایەکێ تێدا بدەن و هەمی ژن دکەڤنە د بن ئەڤێ مەسەلێدا و ئەوان بنەمایێن دروست (ئصولێ شەریعەتی) بخۆڤە دگریت کو ژن ب هەمیڤە شەرمینگەهە)[1]

ئیمامێ جەصاص _خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت_ دبێژیت: (ئەڤ حوکمە خۆ ئەگەر تایبەت ب پێغەمبەری ﷺ و هەڤژینێن ویڤە هاتبیتە خوار، ڕامانا ئەوێ یا گشتییە بۆ ئەوی و غەیری ئەوی ژی، چونکی فەرمان یا ل مە هاتییە کرن کو ئەم ل دویڤ ڕێکا ئەوی بچین و چاڤ ل وی بکەین، ئەو نەبیت خودێ تشتەک ب ئەوی تایبەت کربیت و بۆ ئوممەتا وی نەبیت)[2]

ڤێجا د ئەڤێ ئایەتێدا بەلگە هەیە کو دڤێت ژن نەفسا خۆ ب پارێزیت، حیجابا ژنکێ یا تەمام بیت و ئەو گشتییە بۆ هەمی ژنکان وەکو بووری د گەل مەدا مە دیارکری.

و ئەگەر ئەم ئەڤرۆ بەرێ خۆ بدەینە تێکەلیا ژنکان ل گەل زەلامان د مالاندا، ل بازاری، ل سەر ڕێکان، ئاخڤتن دناڤبەرا ژن و زەلاماندا، بەلکو هندەک ژ ئەوان ل گەل د ئاخڤن ب هێجەتا هندێ کو خوشکا ئەوییە و ئەز نزانم کا ئەرێ ئەو دێ ڕازی بیت کو خوشکا ئەوی ل گەل زەلامەکێ بیانی ب ئاخڤیت؟ ئەڤە هەمی نە یا دروستە (حەرامە) خودێ و پێغەمبەرێ وی ﷺ ژێ رازی نابیت.

---

[1] تفسير القرطبي/(٢٢٧/١٤)
[2] احكام القرآن/(٢٤٢/٥)

## تێکەلی (اختلاط)

پشتی ئەڤێ چەندێ تێکەلبوونا ل گەل زەلامان دهێت، پێغەمبەری ﷺ فەرمانا مە یا کری کو ئەم ئاگری ژ دارا دویربکەین، ئانکو: د ناڤبەرا ژن و زەلاماندا ژێک جودا بکەن، کو ژن دەنگێ خۆ نازک نەکەت: ئاخفتنا ئەوێ ل گەل زەلامان یا نەرم و نازک بیت، ئەز نزانم مەرەما ئەوێ ب ڤێ چەندێ چییە؟ و ئەز نزانم کا ئەوێ گۆتنا خودێ خواندییە دەما باشترین ژن ژ ئەڤێ چەندێ پاشڤە لێداین و گۆتی: **(يَـٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَد مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَض وَقُلۡنَ قَوۡلا مَّعۡرُوفا)** [1]

ئانکو: (ئەی ژنکێن پێغەمبەری هوین د قەدر و بهایدا نە وەکو ژنکێن دینە، ئەگەر هوین ژ خودێ دترسن و تەقوا ئەوی دکەن، هوین ب گۆتنەکا وەسا نەرم و نازک ل گەل بیانییان نە ئاخڤن کو ئەوان کەسێن دلێن وان تشتەکێ نە باش تێدا هەبت ببەنە خرابییێ و ئەڤە تۆرەیەکێ واجبە ل سەر هەر ژنەکا باوەری ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ هەبت وهوین گۆتنەکا دویر ژ گومانێ و خرابییێ بێژن)

و تشتێ مرۆڤی ب خەم دئێخیت ئەوە مرۆڤ کچا موسلمان دبینیت، ل زانکوییێ و ل کافیتیریایێ د ڕوینشتی پێکڤە، چ ڕێگر و چ تشت د ناڤبەرا ئەواندا نینن وان ژ ئێک جودا بکەن، پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: **( الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ فَإِذَا**

---

([1]) الاحزاب: ٣٢

**خَرَجَتِ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ وأَقرَبُ مَا تَكون مِنَ رَحمَةِ ربِهَّا وَهِي في قَعرِ بَيتِها)** (1)

ئانكو: (ژن هەمی شەرمینگەهە ڤێجا ئەگەر ئەو ژ مالا خۆ دەركەڤت شەیطان بخێرهاتنا ئەوێ دكەت و نیزیكترین جهـــ بۆ ئەوێ كو ئەو نیزیكی دلوڤانییا خودێ بیت ئەوە د كونجا مالا خۆڤە بیت)

و یا خرابتر تو دێ بینی ئەو د ترومبێلاندا، ل سەر رێك و جادەیان د رۆینشتی نە، دەرسووك ژی یا ل بەر و ب رەخ ئەوێڤە قوتابی یێن كورن، هەروەكو ئەو مەحرەمێن ئەوێ..!

ئەگەر ئێكێ ئەو ژ ئەڤێ چەندێ هشیار كر دێ ب ئارامی ڤە بێژیتێ: ئەو برایێن منن..!

وەی بۆ ئەڤی تشتێ سەیر...! ئەرێ ما تشتێ حەرام حەلال بوویە؟

ئەرێ مە حەرامی ژبیر كرییە؟

ئەرێ ما شەریعەتێ خودێ هاتییە گوهۆڕین؟

چاوا ئەو دێ بیتە برایێ تە و بیانییە بۆ تە و بۆ ئەوێ دروستە ئەو هەڤژینییێ ل گەل تە پێك بینیت؟

ئەرێ ما مە د ئیسلامێدا گوهـــ لێ بوویە ئێكێ خوشكا خۆ خاست بیت؟

ئەی خوشكا من یا موسلمان:

كا نێ شەرم؟ كا نێ هەیبەت؟ و كا نێ ئیسلام د نەفسا تەدا؟

---

(1) أحكام النظر ، الصفحة أو الرقم : 137

ئەرێ ما تە ئیسلام و فێرکرنێن ئەوێ ژبیرکرن؟ یان فلم و زنجیران تو د سەردابری ئەوێن کو ب شەڤ و رۆژ خرابییێ پێش چاڤ دکەن، سترانا و بەرێخودانا زەلامان ئەوا کو خودێ د قورئانێدا حەرام کری، کێمەکێ تێ نەبن ئەو ناخینن!

## پشتەڤانییا بێ ستارەیییێ:

شیرەتا من بۆ ئەوان یێن پشتەڤانییا وان دکەن یێن ئەڤان مۆدێلێن جلکان و دەرسووکان بەلاڤ دکەن و ئەوان حیجابێن کو خۆ ب ئەڤێ گۆتنێ دئینەدەر: حیجابا ئیسلامی، د ڕاستیدا ئیسلام یا بەرییە ژ ئەوان مۆدێلا، ئەڤجا گۆتنا مە بۆ ئەوان درینگەهێن کو ڤان مۆدێلان د درن ئەو مۆدێلێن کو سەرپێچییا جلکێ ئیسلامێ تێدا، بۆ ئەوان خودانێن جهان یێن کو ڤان جلکا د فروشن، ئەم دبێژینێ دەستا ژ ئەوێ بەردە یا خودێ ئەم پاشقە لێداین، ئەڤە هاریکاری کرنە ل سەر باطلی و بێ خێرییێ و خودێ یا گۆتی: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾[1]

ئانکو: (و هوین د ناڤبەرا خۆدا هاریکارییێ ل سەر کرنا خێرێ و تەقوا خودێ بکەن و هوین هاریکارییێ ل سەر کرنا گونەهێ و پێ لێدانا توخویبێن خودێ نەکەن و هشیاری بێ ئەمرییا خودێ بن، هندی ئەوە ئەو یێ عەزاب دژوارە)، ڤێجا خودێ ڕازی نابیت ب خرابی و کرێتییێ وەکو دبێژیت: ﴿وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾[2]

ئانکو: (و خودێ پاشقەلێدانا ژ هەر کار وگۆتنەکا کرێت دکەت و ژ هەر تشتەکی یێ شەریعەت ژێ ڕازی نەبیت ژ کوفرێ و گونەهان و ژ زۆرداریێا ل خەلکی و ستەما ل سەر ئەوان و خودێ -ب ڤێ فەرمانێ و پاشقەلێدانێ-

---

(1) المائدة: ٢
(2) النحل: ٩٠

شیرەتان ل هەوە دکەت و بیرا هەوە ل دووماهییان دئینتەڤە؛ دا هوین فەرمانێن خودێ ل بیرا خۆ بینن و مفای ژێ وەربگرن).

## گۆتنێن زانایان ل دۆر خیمارێ:

١ــ ل دەستپێکا ئیسلامێ ژنکێن موسلمانان خیمار نەدکرنێ، دەما ئەڤ گۆتنا خودێ هاتییە خار: (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ)

وان خیمار کرنێ، وەکو دەیکا مە عائیشایێ ــخودێ ژێ رازی بیت ــ گۆتی: خودێ دلوڤانییێ ب ژنکێن مشەختیێن دەستپێکێ ببەت ل دەمێ ئەڤ گۆتنا خودێ هاتییە خار (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ) ئەوان دەهمەنێن جلکێن خۆ ژێڤەکرن و کرنە خیمار بۆ خۆ.

حافظ ئبن حەجەر دبێژیت: (**فاختمرن**): ئانکو ناڤچاڤێن خۆ پێ د ڤەشارتن)[1]

٢ــ د سەرهاتییا ئیفکێدا (ئەو بێ بەختییا ل دویڤ دەیکا مە عائیشایێ ڤە هاتییە دانان) گۆتنا عائیشایێ ــخودێ ژێ رازی بیت ــ ل دۆر صەفوانێ کورێ موعەطیلی ــخودێ ژێ رازی بیت ــ : (ئەوی ئەز نیاسیم دەما ئەز دیتیم و ئەوی ئەز دیت بووم ژ بەری حیجاب فەرزببیت)[2]

ڤێجا بەلگە تێدا هەیە کو پشتی حیجابێ ئەوان ئەو نە د دیتن، چونکی ئەوان خیمار ل بەر خۆ دکرن.

---

[1] فتح البارى شرح صحيح البخارى ج٨:ص٣ تحقيق عبدالقادر شيبة الحمد
[2] (رواه البخارى (٤٧٥٠)، ومسلم (٢٧٧٠))

٣ــ پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دبێژیت: **(لا تنتقب المرأة المحرمة، ولا تلبس القفازين)** ئانكو: ( ژن ل دەمێ ئیحرامان پێچێ ناكەتێ و هەروەسا دەستگوورکا ژی ناكەتێ)[1]

ئەڤ حەرامبوونە ل دەمێ حەجێ یە، تێگەهێ هەڤدژ ل دەڤ **(ئصولییا)** کو ئەگەر نە د ئیحراماندا بیت دێ پێچێ و دەستگوورکا کەتێ.

ئیمامێ ئەبو بەکر بن ئەلعەرەبی مالکی دبێژیت: (و ئەڤە نە ئەو ئبن عەرەبییە یێ کو صوفی و عەقیدا ئەوی عەقیدا **(وحدة الوجود)** ، بەلکو ئەڤە ئبن العەرەبییە ئەوێ زانایێ ئەهلێ ئەندەلوس) ئەڤە ژی ژبەر هندێ چونکی گرتنا ناڤچاڤێن ئەوێ ب پێچێ فەرزە ژبلی حەجێ، ڤێجا ل دەمێ حەجێ ئەو دێ تشتەکی ژ خیمارێ دانیتە بەرچاڤێن خۆ بێی کو پێڤە ب نوسینیت، داکو بەرێ هەردووکان ژ ئێک بهێتە وەرگێران.

٤ــ ژ ئبن عەباسی ــخودێ ژێ رازی بیتــ: (درستە جلبابا خۆ نێزیکی ناڤچاڤێن خۆبکەت و ل سەر ناڤچاڤێن خودا بینیتە خارێ بەس نەوەکو پێچێ ناف چاڤێن خۆ گرێدەت و ب شدینیت).

رەوح د فەرموودا ئەویدا دبێژیت: من گۆت: درستە ژن وەکو جلباب یان ڕێپێچا خۆ دناڤچاڤێن خۆدا بەردەت بەس نە وەکو پێچێ کو ب شدینیت بەس هەما بەردەت وەکو خێلیێ.

٥ــ و هەر ژ ئبن عەباسی ــخودێ ژێ رازی بیتــ د ئەڤێ گوتنا خودێدا: **(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ)**، خودێ فەرمانا ژنێن خودان باوەرکر کو ئەگەر ئەو ژ مالێن خۆ

---

[1] رواه البخاري (١٨٣٨)

دەرکەڤتن بۆ پێدڤییەکێ دڤێت ئەو خۆ ژ سەرێ خۆ هەتا ناڤچاڤێن خۆ ڤەشێرن ب جلبابی و چاڤەکێ خۆ ب تنێ دەربێخن[1].

**دێ بەحس ل هندەک ژ گۆتنین زانایان کەین:**

زانایێن هەر چار مەزهەبان ئێک دەنگن ل سەر دروستییا خیمارێ کو ناڤچاڤێن خۆ پێ ڤەشێرن، نە ئێک دەنگی د ئەڤێ چەندێدا ب تنێ یا د ئێک مەزهەبدا، د مەزهەبێ ئیمام ئەحمەددا و یا دروست د مەزهەبێ شافعیدا کو واجبە ل سەر ژنێ ئەو دەست و ناڤچاڤێن خۆ ب ڤەشێریت ژ زەلامێن بیانی، مەزهەبێ ئەبی حەنیفە و مالکی ل دەڤ ئەوان سوننەتە، بەلێ زانایێن حەنەفی و مالکییان فەتوا دایە کو دەما فتنە زێدە دبن واجب دبیت ل سەر ژنێ ئەو ناڤچاڤ و دەستێن خۆ ژی ب ڤەشێریت و هندەک ژ زانایێن ئەوان ژی گۆتییە کو واجبە.

ئەم دێ بەحسێ گۆتنێن ئەوان کەین یێن گۆتین واجبە وەک بەرسڤ دانەک بۆ وان یێن تانان د داننە ئەوان یێن پێچێ دکەنێ و ناڤچاڤێن خۆ پی دڤەشێرن.

**یا ئێکێ**: **گۆتنێن هندەک ژ زانایێن حەنەفییان** _خودێ دلوڤانییێ ب ئەوان ببەت_ :

فقهزانێن حەنەفییان دبینن کو نابیت ژن ناڤچاڤێن خۆ دیاربکەن بەرامبەر زەلامێن بیانی ژبلی مەحارما، نە چونکی شەرمینگەهە (عەورەتە)، بەلکو چونکی دیارکرنا ناڤچاڤان فتنە و خرابییان ل دویڤ خۆدا دهینیت،

[1] (تفسیر الطبری (سورة الاحزاب ٥٩))

هندەک ژ ئەوان دبینن کو ناڤچاڤ و دەست ژی ب ڕەنگەکێ گشتی شەرمینگەهە.

دێ بەحس ل هندەک ژ گۆتنێن ئەوان کەم.

١_ئیمامێ طەحاوی یێ حەنەفی دبیژیت: نابیت کچا گەنج ناڤچاڤین خۆ دیار بکەت د ناڤ زەلاماندا[1].

٢_ئبن عابدین د شروڤەکرنا گۆتنا طەحاوی یا بووریدا دبیژیت: ڕامان ژێ ئەوە کو نابیت ئەو ناڤچاڤێن خۆ دیاربکەت ژ ترسا هندێ کو کورەک یان زەلامەک ناڤچاڤێن ئەوێ ببینیت و پی بکەڤتە د فتنێدا، چونکی دبیت ل دەمێ کچ ناڤچاڤێن خۆ دیاردکەت کورەک یان زەلامەک ب دلچوونڤە بەرێ خۆ بدەتێ[2].

دیسان دبێژیت: حەنەفی دبینن کو هەتا د ئیحراماندا ژی واجبە ل سەر کچێ ئەو ناڤچاڤێن خۆ ب ڤەشێریت ل دەڤ زەلامێن بیانی و سوننەتە ئەگەر چ زەلامێن بیانی ل دەڤ نەبن[3].

٣_ئەبوکر جەصاصێ حەنەفی دبێژیت: کچا گەنج فەرمان یا ل ئەوێ هاتییە کرن کو ئەو ناڤچاڤێن خۆ ب ڤەشێریت ژ زەلامێن بیانی، ئەو ستر و دەهمەن پاقژیا خۆ دیاربکەت ل دەمێ ئەو ژ مال دەردکەڤیت، داکو کەسێن دل پیس دلێ خۆ نەبەنێ[4].

---

[1] (حاشية الطحاوی علی مراقی الفلاح ص٢٤١، (رد المختار ٢٧٢/١))
[2] حاشية ابن عابدين (رد المختار (٤٠٦/١)
[3] (حاشية ابن عابدين ٥٢٨/٢)
[4] (احكام القران (٢٤٥/٢))

**یا دوویێ: گۆتنێن هندەک ژ زانایێن مالکییان** _خودێ دلوڤانییێ ب ئەوان ببەت_ :

گۆتنێن ئەوان وەکو گۆتنێن حەنەفییانە، دێ بەحس ل هندەک ژ گۆتنێن ئەوان کەم:

١_ئەبو بەکر ئبن ئەلعەرەبی مالکی و قورطوبی دبێژن: ژن هەمی شەرمینگەهە، لەش و دەنگێ ئەوێ، ڤێجا نابیت ئەو ڕەنگ و دەنگێ خۆ دیاربکەت بۆ کارەکێ فەر نەبیت، وەکو شەهدەدانا ل سەر ئەوێ، یان ژی برینەک یان نەساخییەک ل لەشی ئەوێ بیت، یان ژی بۆ پرسیارکرنەکێ بیت[1].

٢_قورطوبی دبێژیت: ئبن خوەیز ژ زانایێن مە دبێژیت: هندی ژنە ئەگەر ئەو یا جوان بیت و ئەو ب ترسیت ژ هندێ کو فتنە ژێ چێببن دڤێت ئەو ناڤچاڤ و دەستێن خۆ ب ڤەشێریت، ژ خۆ ئەگەر یا دان عەمر بیت یان ژی نە یا جوان بیت دروستە بۆ ئەوێ ئەو ناڤچاڤ و دەستێن خۆ دیاربکەت[2].

ئیمامێ جەلیل ئبن عەبدولبەرێ مالکی گۆتییە: کو ئیجماعا ل سەر هندێ واجبە ژن ناڤچاڤێن خۆ ب ڤەشێریت.

٣_حەطابێ روعەینییێ مالکی دبێژیت: و تو بزانە ئەگەر هات ترس هەبوو ل سەر ژنکێ کو فتنە ژێ چێببیت واجبە ل سەر ئەوێ کو ئەو هەردوو دەست و ناڤچاڤێن خۆ ب ڤەشێریت[3].

---

(1) (احكام القران (٦١٦/٣)، وا؛جامع لاحكام القران/(٢٧٧/١٤))
(2) (القرطبى (٢٢٩/١٢))
(3) (مواهب الجليل ٤٩٩/١)

**یا سییێ: گۆتنێن هندەک ژ زانایێن شافعییان** _خودێ دلوڤانییێ ب ئەوان ببەت_ :

فقهزانێن شافعییان دبینن کو نابیت ژن ل بەرامبەر زەلامێن بیانی ناڤچاڤێن خۆ دیاربکەت، چونکی دیارکرنا ناڤچاڤان فتنێ ل دویڤ خۆدا دهینیت و هندەک ژ ئەوان دبینن کو دڤێت ژن لەشێ خۆ هەمیێ ب ڤەشێریت بەرامبەر زەلامین بیانی، هەردوو دەست و ناڤچاڤ ژی دکەڤنە د بنڤە[1].

١_ئیمامێ حەرەمەین جووەینییێ شافعی دبێژیت: موسلمان هەمی ئێک دەنگن کو نابیت ژن ب سفوری[2] دەرکەڤیت، چونکی ئەڤ چەندە فتنێ ل دویڤ خۆدا دئینیت و دبیتە ئەگەرێ لڤینا شەهوەتێ، ڤێجا تشتێ ژ هەژی شەریعەتی ئەوە ئەڤی دەرگەهی بگریت، دویربکەت ژ ئەوان تشتێن فتنە ل دویڤدا دهێن، وەکو مانا ب تنی دگەل زەلامێن بیانی[3].

٢_ئبن رسلانێ شافعی دبێژیت: موسلمان هەمی ئێک دەنگن کو نابیت ژن ژ مال دەربکەڤیت و ناڤچاڤێن ئەوێ د دیاربن، ب تایبەتی د سەردەمەکیدا ئەگەر کەسێن بێ شەرم زێدەببن[4].

---

(1) انظر (الاشباه والنظائر/ص٢٤٠)

(2) سفور: دزمانێ عەرەبیدا یا ژ سفر هاتی، بۆ ئەوێ کچا ناڤچاڤێن خۆ دەردئێخیت بکاردهێت. بەس تبرج گشتیترە ژ سفورێ، زانا دبێژن تبرج هەمی لەشیڤە یا گرێدایە، نموونە: عەبای نەکەتێ، دەست و پێن وێ دەربکەڤن. بەس سفور ناڤچاڤڤە گرێدایە.

(3) (روضة الطالبين ٢٤/٧)

(4) (عون المعبود ٢٨٤/١١)

٣_ئبن حەجەر عەسقەلانی دبیژیت: ژ عەدەتێ ژنکان د کەڤن و نوکەدا بەردەوام ئەو ناڤچاڤێن خۆ ڤەدشێرن ژ زەلامێن بیانی[1].

٤_ئیمامێ سیوطی دبیژیت: ژنێ د مەسەلا شەرمینگەهێدا چەند ڕەوشەک هەنە: ڕەوشەک ل گەل زەلامێ ئەوێ، د ئەڤێ ڕەوشێدا چ شەرمینگەهـ د ناڤبەرا ئەواندا نینە، ڕەوشەک ل گەل بیانییان و شەرمینگەهـا ئەوێ لەش هەمییە، خۆ هەردوو دەست و ناڤچاڤ ژی[2].

**یا چارێ: گۆتنێن چەندین زانایێن مەزهەبێ حەنبەلیان** _خودێ دلوڤانییێ ب ئەوان ببەت_ :

فقهزانێن حەنبەلییان دبینن کو نابیت ژن ناڤچاڤێن خۆ دیاربکەن ل بەرامبەر زەلامێن بیانی.

١_ئیمامێ ئەحمەد _خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت_ دبێژیت: هەر تشتەک ژ ژنکێ شەرمینگەهە، خۆ نینوکێن ئەوێ ژی و گۆت: جوانییا ئەوێ یا ب سەرڤە، جلک و هەر تشتەکێ وێ شەرمینگەهە ، -ئانکو: ژن- خۆ نینوکێن وێ ژی شەرمینگەهە و گۆت: نینوکێن ژنکێ شەرمینگەهە، ڤێجا ئەگەر هات و ئەو ژ مال دەرکەڤت نابیت دەست و نینوک نە ژی خوفکێ[3] وێ دیاربن، چونکی هندی خوفکن پێن ئەوێ وەسف دکەن[4].

---

(1) (فتح الباری/(٩/٣٢٤))

(2) (الاشباه والنظائر/ص٢٤٠))

(3) خوفک وەکی گورانە ژ چەرمێ گیانەوەرا دهێتە چێکرن، د نوکەدا ئەگەر گورە یا ستیربیت ل سەر گوزەکێدا بیت هەر ل شینا خوفکێیە.

(4) (أحکام النساء لامام احمد_روایة الخلال ص٣٢_٣٣)

٢_ئبن تەیمییە _خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت_ دبێژیت: دیارکرنا ناڤچاڤان کو زەلامێن بیانی ببینن ئەڤە ناچێبیت، پێدڤییە ل سەر سەرکارێ ئەوێ فەرمانا ب باشییێ بکەت و پاشڤەلێدانێ ژ ئەڤێ خرابییێ و هەر خرابییەکا هەبیت بکەت و هەچییێ وەنەکەت ئەو دێ سزاییێ ئەڤێ چەندێ وەرگریت[1].

٣_ئبن قەیم _خودێ دلوڤانییێ پێ ببەت_ دبێژیت: هندی شەرمینگەهە دوو جۆرن: شەرمینگەهەک د بەرێخودانێدا، ئێک ژی د نڤێژێدا، ڤێجا ژنکا ئازاد بۆ ئەوێ دروستە ئەو نڤێژا خۆ بکەت و هەردوو دەست و سەروچاڤ د دیاربن و بۆ ئەوێ دروست نینە ئەو وەسا ژ مال دەربکەڤیت[2].

و ئەز دبێژم: ڤێجا پا چ بێژین بۆ موسلمانێن ئەڤرۆ ئەو خۆ نیشا زەلامان دکەن، خەما ئەوێ یا ژ هەمییێ مەزنتر ئەوە، ئەو ب جوانترین جلک و سەروبەر ژ مال دەربکەڤیت!

**مەترسیەکا هەی دڤێت ئەم لێ د هشیاربین:**

ل ڤێرێ کارەکێ هەی دڤێت ئەم ژێ بهێینە هشیارکرن، ئەو ژی: دێ بینی گەلەک زەلامان پشتگوهـڤە هاڤێتیە و گرنگی نەدایە هندێ کو ژنکێن ئەوان حیجابا دروست ل مالێ بکەنە بەرخۆ ل بەرامبەر برایێن ئەوی (تی یێن ژنکێ) و کەسوکارێن ئەوی، چەند ئاریشە و خیانەتا هەڤژینییێ چێبوینە دگەل برایێ زەلامێ ژنکێ و کەسوکارێن زەلامی؟ ئەڤە هەمی ژ ئەگەرێ هندێ چێبوینە کو ئەو ژنکە پێگیر نەبوینە ب حیجابا دروست، ژ ئەگەرێ سستییا زەلامایە د ئەڤێ مەسەلێدا.

---

[1] (مجموع الفتاوى ٣٢٨/٢٤)
[2] (اعلام الموقعين/ (٢/٤٧)

**خوشکێن هێژا :**

هندی پێغەمبەرێ خودێ یە ـــسلاف لێ بن ـــ چوونا زەلامی ل دەڤ ژنبرا وی (ئانکو زەلام بچیتە مالا برایێ خۆ و ژنبرا ئەوی بتنێ ل مال بیت) وەکو مرنێ لێ دکەت (ژبەر مەترسیا ئەڤێ کاری).

**عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ - رضي الله عنه - أَنَّ رَسُولَ اللهِ - صلى الله عليه وآله وسلم - قَالَ: (إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ)، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ: (يَا رَسُولَ اللهِ أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟)، قَالَ: (الْحَمْوُ الْمَوْتُ)** [1]

ژ کیسێ عوقبەیێ کورێ عامری ـــخودێ ژێ رازی بیت ـــ کو پێغەمبەر ﷺ دبێژیت :( هشیاربن ژ چوونا ل دەڤ ژنکان) ، زەلامەکێ ژ ئەنصاریا گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ پا ئەگەر حەمو بن؟ (مرۆڤێن زەلامێ ژنکێ بن وەکی برا، پسمام، کورخال ...هتد.) گۆت: هندیکە کەسوکارێن زەلامی نە ئەو مرنە (ئانکو مەترسیەکا دژوارە).

ژ سەیرترین چیرۆکێن من خاندین د غیرەتا زەلامیدا ئەوە دەما کو هەڤرکی چێبووی د ناڤبەرا ژنەکێ و زەلامێ ئەوێدا و چوونە ل دەڤ دادوەرێ باژێرێ رەیی، ئەوێ ژنکێ داخازا زەلامێ خۆ کر، گۆت زەلامێ من مەهرا من یا خاری ٥٠٠ دینارن و گۆت: ئەوی ب ئێکجاری نەدایە دەستێ من، زەلامێ ژنکێ ژی گۆت: وەنینە وەکو ئەو دبێژیت، ڤێجا ئەو دیدەڤان هاتن یێن کو ل رۆژا گرێبەستا هەڤژینیێ ئامادەبووین، دیدەڤانا گۆت: دڤێت ئەم ناڤچاڤێن ئەوێ ببینین هەتا کو بزانین هەڤژینا ئەوی یە، ل دەمێ زەلامێ ئەوێ ئەڤ

---

[1] قال البهوتي في شرح المنتهى (١٦٧/١)

چەندە گوهـ لێ بووی  کرە هەوار و گۆت: وەنەکەن، ئەو ڕاست دبێژیت: (ئەوی دقیا ژنکا خۆ ب پارێزیت داکو زەلام دێمێ وێ نەبینن) ، ل دەمێ ژنکێ ئەڤ چەندە ژ زەلامێ خۆ دیتی کو ئەوی ئەڤ چەندە کر بتنێ داکو دێمێ ئەوێ ب پارێزیت ژ بەرێخودانا دیدەڤانان، ژنکێ گۆت: من ئازاکر ژ مەهرا خۆ ل دونیایێ و ئاخرەتێ ئەو ئازایە.

**ئەڤجا شیرەتا من بۆ تە ئەی کچا موسلمان:**

تو نە بە وەکو ستریەکێ(درکەکێ) نەفسا خۆ ژی و بەرامبەری خۆ ژی ئەزیەت بدەی، هندیکە جوانیە فیتنەیە بۆ تە، ڤێجا تو دلوڤانیێ ب ئەوان گەنجێن بەرزە ببە یێن د ئەڤێ سەردەمیدا، تو بزانە ئەی خوشکا من هندی بێ سەروبەرییا د جلکاندا یە دێ بەرێ تە دەتە ئاگری و تە دویرکەت هەتا ژ بێهنا بەحەشتێ!

پێغەمبەر ﷺ دبێژیت: **(صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ. وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ. لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا).**

ئانکو: دوو جۆرێن مرۆڤان یێن هەین ژ ئەهلێ ئاگری و من نەدیتینە، هندەک زەلامن قامچی یێن د دەستێ ئەواندا وەکو کوریا چێلا نە و خەلکی پێ دقوتن و هندەک ژنکن جلوبەرگ یێن لبەر بەلێ د ڕیسن(ژبەرکو گەلەک تەنگ و بێ سەروبەرن هەروەکو جلک نەلبەر) و د ڕێڤەچوونا خۆدا خۆ د هەژینن یان خۆ مەزن دکەن و پرچا خۆ وەکو پشتا حێشترێ لێ دکەن، ئەڤ هەردوو جۆرە ناچنە بەحەشتێ و خۆ بێهنا بەحەشتێ ژی ناگەهیتێ و هندیکە بێهنا بەحەشتێ یە دویراتیا هندە هندە ڕێکێ دچیت.

**شیرەتا من بۆ تە ئەی خوشکا موسلمان:**

تو دەست ژ ڕەخنێن خەلکی بەردە، چونکی هندی حسابا خودێ یە دژوارتر و مەزنترە، بەردەوام تو بزاڤێ بکە بەرەڤ ڕازیبوونا خودێ ڤە بچی و تو دێ بینی وەکو تو موکوم بزڤری بال ب خودێ ڤە خودایێ مەزن قەنجی ل گەل تە دکەت دێ ڕێزێ لتە گریت، تو بزانە هندی گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ ئەوی یە ﷺ کو تو حیجابێ بکەیە بەر خۆ ئەڤ کارە دێ تە کەتە د بەحەشتێدا، نە گوهداری و سەرپێچیا تە د سفورییێدا نە پێگێریکرنا تە ب مەرجێن حیجابا دروست دێ تە کەتە د ناڤ ئاگریدا.

چونکی پێغەمبەر ﷺ دبێژیت:

( كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إِلَّا مَن أَبَى، قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَن يَأْبَى؟ قالَ: مَن أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَن عَصَانِي فقَدْ أَبَى)

ئانکو: هەمی ئوممەتا من دێ چنە بەحەشتێ بتنێ ئەو نەبیت یێ نەڤێت بچیت، گۆتنێ: یا پێغەمبەرێ خودێ ڤێجا ئەو کینە نەڤێت؟ گۆت: هەرکەسێ گوهداریا من بکەت دێ چیتە د بەحەشتێدا و هەرکەسێ نە گوهداریا من بکەت ئەوی نەڤێت.

تو بزانە ئەڤێن بەرێ خۆ د دەنە تە ئەوان چ ژ تە نەڤێت بتنێ کو خوشیەکێ بۆ خۆ ب تە ببەن و ب ئاخڤتنێن خۆ تە د خاپینن، ب ڕاستی ئەم یێ د سەردەمێ گورگادا، کێم یێن هەین ڕاستگۆ، ڤێجا تو گەلەک هشیاربە ژ ئەوان، ئەڤان بتنێ پاقژیا تە دڤێت و پاشی دێ تە هێلن و پشتگوهڤە هاڤێژن و تو دێ بییە ژ خوسارەتان.

**ئەی خوشکا موسلمان:**

تو گوهێ خۆ نەدە ئەو کەسێن کو خودێ ژبیرکری، بەلکو تو گوهداریا خودایێ خۆ بکە، هەروەکو خودایێ مەزن دبێژیت:

**(وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَـٰسِقُونَ)[1]**

ئانکو: (و هوین -گەلی خودان باوەران- وەکو ئەوان نەبن یێن ئەو حەق هێلای یێ خودێ ل سەر ئەوان واجبکری، ڤێجا ژبەر هندێ ئەوی بارا وان ژ وان خێرێن وان ژ عەزابا ڕۆژا قیامەتێ ڕزگار دکەت ژ بیرا وان بر، ئەوێن هەنە یێن بێ شەرم، یێن کو ژ بن ئەمرێ خـودێ و پێغەمبەرێ ئەوی دەرکەڤتین)

**ئەی خوشکا موسلمان :**

ئەگەر شەیتانی دوودلی بۆ تە دروستکر تو هزرا ئاگرێ جەهەنەمێ بکە ئەگەر سەرپێچیا خودێ بکەی، ئەگەر دونیایێ ب جوانیا خۆ تو خاپاندی ئەوی دەمی هزرا قەبری بکە و تارییاتیا ئەوی، ئەگەر تو غەریببی و دلێ تە دچیتە خوشیێن دونیایێ تو سوزا خودێ ژبیرنەکە بۆ خودان باوەران کو خوشیا بەردەوامە ل ئاخرەتێ، هندیکە خوشیێن بەهەشتێ نە بەردەوامن و هندیکە خوشیێن دونیایێ نە د بەروەختن، ئەگەر جوانیا تە تو خاپاندی تو هەستیێن خۆ بینە ل سەر هزرا خۆ چەند ب ترسن و تو بزانە جوانی نە گرنگترین تشتە د گەردوونیدا، ئەگەر جوانی بچیت چ بۆ ژنکێ نامینیت بەلکو بتنێ شەرەف و بەرێزی و پلا ئەوێ دێ مینیت.

[1] الحشر: ١٩

و قەد ئەوێ هزرێ نەکە کو حیجاب دێ جوانیا تە کێم کەت، بەلکو پێچەوانەی ئەوێ دروستە، هندیکە حیجابە جوانیا تە زێدەتر دکەت، ب راستی ژی زەلام ئەوان ژنکان دخوازن یێن کو خۆ دپارێزن، تو بەرێ خۆ نەدە وان ژنکێن سفور کو چەوا گەنج دکەڤنە ل دویڤ واندا، ئەڤێن هەنێ ئنیەتا وان بتنێ خوشیەکە، ئەڤجا ئەگەر ژێ تێربون دێ هاڤێژن و دێ ئێکا دی بۆ خۆ گرن.

و تو بزانە یێ تە بۆ خۆ بخوازیت و هەڤژینییێ ل گەل تە بکەت ژبەر جوانیا تە ئەو دێ تە گەلەک ئەرزان فروشیت دەمێ تو ئەوێ جوانیێ ژ دەست ددەی، بەلێ ئەو کەسێ هەڤژینییێ ل گەل تە بکەت ژبەر دین و حیجابا تە ئەڤە دێ تە پارێزیت ل درێژاهیا ژیێ خۆ، ئەز هیڤیێ ژتەدکەم تو ل دویڤ هەوایێ نەفسا خۆ نەچە، ل دویڤ حەز و ئارەزوویێن خۆ نەکەڤە، چونکی ئەڤە دێ تە ژ رێکا خودێ لادەت، تو پێگیریێ ب قورئانێ بکە و تو فەرمانێن ئەوێ جێبەجێ بکە، پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دبێژیت: **(إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ)**[1]

ئانکو: (خودێ هندەک مللەتان ب ئەڤێ پەرتووکێ بلند دکەت و هندەکێن دی پێ دئینیتە خوارێ).

(1) رواه مسلم ٨١٧

**ل دووماهیێ:**

ئەی خوشکا موسلمان: ئەم دێ چاوا ل هیڤیا مەهدەرا موحەممەدی بین ﷺ و ئەم هەڤدژی سونەتا ئەوی نە، خودایێ مەزن دبێژیت: ( **وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَـٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ**)[1]

ئانکو: (و هەچییێ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ ئەوی نەکەت، کو باوەرییێ ب توخیبێن وی نەئینت، پێ ل ئەوی شەریعەتی بدانت یێ وی بۆ بەنییێن خۆ دانای چ ب گوهۆڕینێ بیت چ ب ڕاوەستاندنا کاری بیت پێ، خودێ دێ ئەوی کەتە د ئاگریدا هەر و هەر دێ تێدا مینیت وعەزابەکا وی ڕەزیل بکەت و بشکێنت بۆ وی هەیە).

ئەڤجا چاوا ژنا موسلمان قەبیل دکەت ل سەر نەفسا خۆ کو ئەو سەرپێچیا خودایێ مەزن بکەت و ئەو ژ مالا خۆ دەربکەڤیت و یا نیڤ ڕویس؟ ئەرێ تو قەبیل دکەی ببیە ئامیرەک د دەستێ جوهییاندا بۆ ژناڤبرنا ئاڤاهیێ ئیسلامێ؟

ئەڤ جوهییە دبێژین: دڤێت ئەم جیلەکێ وەسا دروست بکەین، کو ئەو شەرم نەکەن دەمێ شەرمینگەهێ خۆ دەردئێخن!

ڤێجا بۆچی ئەم دێ ئارمانجێن ئەوانا بجهئینین؟

ئەی خوشکا موسلمان: تەوبە بکە بەر ب خودایێ مەزن ڤە، تەوبەکا ژدل دەمێ جارەکا دی دلێ تە دچیتە خرابیێ ئەو تەوبە شیرەتێ ل تە بکەت، هەروەکو خودایێ مەزن دبێژیت: (**يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً**

(1) النساء: ١٤

نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ )[1]

ئانكو: (ئەی ئەوێن باوەری ب خودێ ئینای و دویکەڤتنا پێغەمبەرێ ئەوی کری، هوین ژ گونەهێن خۆ تۆبە بکەن تۆبەیەکا وەسا یا زڤڕینا ل گونەهێ د دویڤدا نەبیت، بەلکو خودایێ هەوە گونەهێن هەوە ژێ ببەت و هەوە بکەتە د ئەوان بەحەشتاندا یێن ڕویبار د بن قەسرێن واندا دچن)

چونکی دەرگەهێ تەوبێ ڤەکریە هەتا ڕۆژا دووماهیێ، تو وەنەکە شەیتان ب تە بکەتە کەنی، کو تو بەردەوامبی ل سەر گونەهێ، شەرمزاری ئەو نینە تو گونەهێ بەرامبەر خودێ بکەی، چونکی هەمی بەنی ئادەم گونەها دکەن، بەلێ شەرمزاری ئەوە تو بەردەوام بمینی د ئەڤێ گونەهێدا و ل دویڤ شەیتانی بچی ڤێجا تو ببی ژ خوسارەتان.

خودایێ مەزن دبێژیت: (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَـٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)[2]

ئانكو: (ئەی ئەوێن باوەری ب خودێ ئینای و دویکەڤتنا پێغەمبەرێ ئەوی کری، هوین خۆ و عەیالێ خۆ ب گوهدانا فەرمانا خودێ ژ ئەوی ئاگری بپارێزن یێ ب مرۆڤ و بەران دهێتە هەلکرن، هندەک ملیاکەتێن ب هێز و

(1) التحريم : ٨
(2) التحريم: ٦

زۆر خەلکێ ئەوی ئاگری عەزاب ددەن و ئەو بێ ئەمرییا خودێ ناکەن و ئەوی تشتی دکەن یێ فەرمان پێ ل ئەوان دهێتەکرن).

وصلى الله على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

انتهيت منه في 1416 هـ .

وتم إضافة بعض التعديلات في 1440 هـ

والحمد لله رب العالمين

# حیجاب

حیجاب چیه؟

حیکمەت ژ حیجابێ چیه؟

مفـــایێن حیـجـــابـــێ چ نـــە؟

حـــوکـــمـــێ حـــــیجابـــێ چیه؟

ســـالوخەتێن حیجابا دروست چنه؟

کرێتی و حەرامییا سفور و بێ ستارەیێ

هندەک شیرەت بۆ خوشکا موسلمانا ب حیجاب

## نڤێسین

## شیڤان شێخەمیری

## حیجاب

بسم الله, الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه: وبعد

یا فەرە چەندەکێ بەحسێ وێ حیجابێ بکەین یاکو خودایێ مەزن ب هەمی مەزناهیا خۆڤە ئەڤ چەندە ل سەر ژن و کچ و خوشکێن موسلمان فەرزکری، شەریعەتێ مە گرنگییەکا زێدە ب پاراستن و نخاڤتنا ژنێ یا دای، ژبەر ئەڤێ ڕێزا هندە مەزن یاکو ئیسلامێ ل ژنێ گرتی، دێ بینی هەر ناڤبەین ناڤبەین هندەک ژ دوژمنێت ئیسلامێ و ژنێ ب ناڤ و ڕەنگێن جێواز هەولێن خۆ ددەن بۆ سارکرنا ژنا موسلمان ژ حیجاب و پاقژیا وێ، هەروەسا ژ لاوازییا هندەک کەسێن باوەردار کو پشتەڤانی و گوهداریا ئاخفتنا ئەڤان جۆرە کەسان دکەن یان بەلاڤ دکەن، ڤێجا د ئەڤان چەند ڕێزێت بهێتدا دێ ب کورتی بەحسێ ڤان تەورا کەم:

## تەوەرێ ئێکێ: حیجاب چیە؟

ستارەكرنا ژنێ یە بۆ لەشێ وێ هەمیێ ب فەرمانا خودایێ مەزن.

ئەو ئایەتێن دەربارەی حیجابێ هاتین د قورئانا پیروزدا:

1. (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) .

2. (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ )

3. (وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى).

4. (وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ).

5. (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)

## تەوەرێ دوویێ: حیکمەت ژ حیجابێ چیە؟

بێ گومان نینە خودایێ مەزن تشتەکی حەرام بکەت (وەکو: بێ ستارەیی و سفورێ) یان گونەهەکێ مەزن بدانیت ئیلا ئەو کار و گونەهە یێ دۆرپێچ کریە ب خرابیا ژهەمی لایانڤە بۆ نموونە: (زنا) گونەهەکا مەزنە و خرابیەکا کرێتە ژبەرکو دا کەس نێزیکی ئەڤێ گونەهێ نەبیت، ئەو هەمی ڕێک و مەبەستێن دگەهنە ئەڤێ زنایێ ژی یێن قەدەغەکرین ژ سفور، بەرێخۆدانا حەرام، نازککرنا دەنگی، تێکەلی و سوحبەت، هەروەسا ب فیتنە چوونا زەلامی ب ژنکێ گەلەک دژوارترە ژیا وێ بۆ وی، زەلام ب جورعەترە کو پتر بەرەڤ زنایێ ڤە بچیت، ژبەر هندێ پتر حەرامیا ل سەر وی هاتییە شداندن، هەرچەندە هەردوو پشکدارن د ئەڤێ حەرامییێدا، بەس چونکی زەلامی شیانێت هەین کو پێنگاڤا پشتی بەرێخودانێ بهاڤێژیت، چێدبیت ژن ژی دشێت دەست پێبکەت بەلێ شیانێن زەلامی بهێزترن، ژبەر هندێ گەلەک ل سەر زەلاما یا هاتییە شداندن کو چاڤێن خۆ بگرن و بپارێزن، یا ل سەر ژنکێ ژی هاتییە کو پێگیربیت ب حیجابا خۆ، داکو ئەو ڕاکێشانا د ناڤبەرا ئەواندا کێم ببیت، خودایێ مەزن دبێژیت: **(قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ)** ئانکو: تو ئەی پێغەمبەر بێژە خودان باوەران بلا ئەو چاڤێن خۆ ژ ئەوی تشتی بگرن یێ بۆ ئەوان حەلال نەبت ژ ژن و شەرمینگەهان و بلا ئەو ناموسا خۆ ژ حەرامییێ بپارێزن.

## تەوەرێ سێێ: مفاییێن حیجابێ چ نە؟

خودایێ مەزن حیجاب یا ل سەر ژنا فەرز کری، ئەگەر ئەو خۆ ب حیجاب بکەن گوهداری بۆ خودایێ مەزن و پێغەمبەری ﷺ و تو بۆ خۆ ب عیبادەت بهەژمێری دێ خودان خێر و پاداشت بی، یێ پێگیر نەبیت دێ ژ هەژی سزای بیت، ب هێلانا ئەوێ دێ ژن توشی گونەهێت مەزن بیت و حیجابێ گەلەک مفاییێن مەزن و مەرەمێن بلند یێت هەین، ژئەوان ژی:

1. حیجاب گوهداریە بۆ خودایێ مەزن و پێغەمبەری ئەوی ﷺ خودایێ مەزن دبێژت: **(وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا)** چونکی ژنا باوەردار ل گەل ئەڤێ فەرمانێ ب ئێمناهی و باوەری و ب یەقین دژیت.

2. حیجاب یا ژنا باوەردارە: چونکی گۆتار ب تایبەت بۆ ئەوانە، ئانکو: هەر کەسەکا پێگیربیت ب حیجابێ براستی ئەو باوەردارا ڕاست و دروستە.

3. حیجاب پاقژی و پاراستنە بۆ دلێ ژنکێ و زەلامی، چونکی هەردوو پێدڤی ب پاقژیا دلی و نەفسێ نە.

4. نیشانەکا دیار و ئاشکەرایە ل سەر ژنکێن پاراستی و دەهمەن پاقژ و چاکییا سەرڤەییا ئەوێ بەلگەکە ل سەر چاکییا وێ یا ناڤدا، پاقژی ژنکێ توشی نەخوشییێ ناکەت، ب تایبەت ژ لایێ ئەوان کەسێت باوەریا وان یا لاواز.

5. حیجاب یا گونجایە ل گەل ئەوێ غیرێ یاکو مرۆڤێ خودان سروشتەکێ ساخلەم ل سەر هاتییە چێکرن، ئەڤە ژ شینواریێت ڕێزلێنانا

مرۆڤییە، ئانکو ئەو سوز و دلینیا زەلامی یە پالددەت بۆ پاراستنا ژنێ ژ هەر حەرامییەکێ.

6. حیجاب گازیکرنە بۆ ئەخلاق و ڕەوشتێ جوان، وەک: پاراستن و خۆ پێچانێ و شەرمێ، شەرم ژی ڕەوشتەکێ پیروزە و چەقەکە ژ چەقێن باوەریێ.

## تەوەرێ چوارێ: حوکمێ حیجابێ چیە؟

ستارەکرنا ژنێ بۆ پرچ و لەشێ خۆ ژبلی ناڤچاڤ و دەستان، ئەڤە واجبە و گۆتنا هەمی زانایانە بێ ناکوکی و خیلاف، هەروەسا ستارەکرنا هەردوو پێیان ژی ل نک زەلاما واجبە ل نک جمهورێ زانایا، بەلێ ناڤچاڤ وهەردوو دەستا خیلاف یا هەی د ناڤبەرا فقهزانێت ئیسلامێدا، کو هندەک ژ ئەوان دبێژن: نە واجبە ژن ستارەبکەت و یێن دی دبێژن واجبە ژن ئەوان ژی ستارە بکەت بۆ ئێکێ ل سەر ئەوێ حەرام یان دیتنا زەلامێ هاتییە خازگینیا تێنەبن، بەلگە ل سەر ئەڤێ گۆتنێ: **(وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)** و ڕاستە ئایەت بەحسێ ژنکێت پێغەمبەری ﷺ دکەت بەلێ بەلگە دێ گشتگیر بیت هەتا بەلگەکێ دی بهێت ئەوێ تایبەت بکەت، ڤێجا ئەگەر ئەڤە بۆ دلێت ژنکێت پێغەمبەری ﷺ پاقژتربیت بێ گومان بۆ غەیری ئەوان دێ پێدڤیتر بیت.

## تەوەرێ پێنجێ: سالوخەتێن حیجابا دروست چنە؟

دڤێت حیجابا دروست هندەک سالوخەت تێدا هەبن هەتا کو بهێتە هەژمارتن ب حیجابا دروست، مەرج و سالوخەت ژی ئەڤەنە:

1. دڤێت حیجاب هەمی کەلواشێ ژنێ ب داپوشت و بنخێڤیت، هندەک ژ زانایا یێ درست کری کو ناڤچاڤ و دەست ژ دەرڤە بن ب مەرجەکێ ئەگەر چ فیتنە ژێ پەیدانەبن بۆ ئەوێ یان غەیری وێ.

2. حیجاب ب خۆ نە یێ ب خەمل و جوانی و زینەت بیت، ژبەر گۆتنا خودایێ مەزن: (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ) خودایێ مەزن حیجاب یا فەرز کری داکو زینەت و جوانییا ژنێ ب ڤەشێریت، ڤێجا یا بەرئەقل نینە کو حیجاب ب خۆ یا ب زینەت بیت.

3. نابیت یێ زەلال و تەنک وشەفاف بیت کو مرۆڤ دبنڤە ببینیت، چونکی جلکێ شەفاف ژنکێ بێ جلک دکەت ( هەروەکو ڕویس).

4. دڤێت یێ فرەهـ بیت و نە یێ تەنگ بیت کو لەشێ ئەوێ چارچوڤە بکەت، چونکی مەرەم ب حیجابێ نەهێلانا فیتنێ و خرابییێ و جلکێ تەنگ ئەڤێ مەرەمێ بجهـ نائینیت.

5. نابیت جلکێ وێ جلکێ ناڤودەنگییێ بیت یان جلکەک بیت کەسێ وەکو وێ نەبیت و بۆ خۆ پێ ب ناڤودەنگییێ بگەریێت د ناڤ خەلکیدا، هەرووەسا نابیت بێهن خوشی و گولاڤا ل ئەڤان جلکا بکەت.

6. دڤێت جلکێن وێ نە وەکو یێت زەلاما بن، چاڤلێکرنا زەلاما نەکەت.

7. دڤێت د جلکێ خۆدا چاڤلێکرنا ژنێت کافر و بێ شەرم نەکەت.

8. دڤێت خۆ ستارە (حیجاب) بکەت ل نک هەر زەلامەکێ بۆ ئەوێ نەمەحەرەم ببت وەکو: کوڕمام، زەلامێ خوشکێ، تی یێن ئەوێ، کوڕخالەت و کوڕمەت...هتد، چونکی ئەڤە نە مەحەرەمن بۆ وێ.

9. دڤێت ژن خۆ ب پارێزیت ژ تێکەلیا ل گەل زەلاما، بۆ ئەوێ نەدروستە (حەرامە) ئەو جوانیا خۆ بۆ ئێکی دیار بکەت ژ بلی زەلامێ وێ.

## تەوەرێ شەشێ: کرێتی و حەرامییا سفور و بێ ستارەیێ:

هندی سفور و بێ ستارەییە گەلەک گونەهـ و کرێتییێن هەین، ژ ئەوان:

1. گونەهـ و سەرپێچییا خودایێ مەزن و پێغەمبەرێ وی یە ﷺ، هەر کەسەکێ سەرپێچییا خودایێ مەزن و پێغەمبەرێ وی ﷺ بکەت کەس ژ ئەوی پێڤەتر زەرەر مەند نابیت.

2. بێ ستارەیی گونەهەکا مەزنە و مرۆڤی دبەتە هیلاکێ، پێغەمبەری ﷺ سوز (بیع) یا وەرگرتی ژ ئومەیما کچا رەقیقی ل سەر ئەوێ چەندێ کو خۆ موتەبەریجە نەکەت وەکو یێت جاهلیەتێ.

3. سفور ئەگەرە بۆ هندێ بکەڤیە ل بن لەعنەت و نەفرەتا پێغەمبەریدا ﷺ و دویرکەڤتن ژ دلوڤانیا خودێ.

4. سالوخەتەکە ژ سالوخەتێن ئەهلێ ئاگری: (پێغەمبەر ﷺ دبێژت: دوو جوینێت هەین ژ ئەهلێ ئاگری نە و من نەدیتینە، ... هندەک ژنن جلکێن ل بەر ئەوانن، هەروەکو د بێ جلک خۆ خار دکەن و پرچا سەرێ خۆ وەکو پشتا حێشترێ لێ دکەن، ئەڤە ناچنە بەحەشتێ و بێهنا بەحەشتێ ژێ ناچیتە ئەوان و بێهنا وێ هندە هندە رێکێ دچیت).

5. بێ ستارەیی و سفور ژ رێک و رێبازا شەیتانییە و ئەو دامەزرێنەرێ هزرابێ ستارەیێ یە، ئەو سەرداری هەر کەسێ یە یێ گوهداریا ئەوی بکەت و سەرپێچیا خودێ بکەت.

6. بێ ستارەیی و سفوری ژ رێک وعەدەتێن جاهلیەتا پیس و گەنی نە.

7. بێ ستارەیی و سفوری ژ پاشکەڤتن و ناڤچوونێ نە، خودایێ مەزن ڕێز یێ ل مرۆڤی گرتی، نیعەتا خۆ یا ل گەل کری ب حەژێکرنا ستارەهیێ و پاراستنا نەفسێ.

## تەوەرێ حەفتێ: هندەك شیرەت بۆ خوشكا موسلمانا حیجاب:

ب ڕاستی هین گەلەک خودان خێرن ب بەرکرنا ئەڤێ حیجابێ و ئەگەر ئەڤ چەندە ژبەر گۆتنا خودایێ مەزن و گوهداریا پێغەمبەری ﷺ کربیت تو یا د ناڤ خێراندا و بۆ تە ب خێر حسابە هندی ئەو حیجابە لبەر تەبیت و حاشا خودا زولمێ ل بەندەیەکا خۆ بکەت، بەلێ دڤێت تو ب دروستی ب حەق و مافێ ئەڤێ حیجابێ ڕابی و ئەڤێ حیجابێ نە بۆ خەلکەکی بکەیێ یان ژبەر خەلکەکی ب دانی و بهێلی یان تو ئەڤی درویشمێ ئیسلامێ بۆ خۆ بۆ مۆدێل و وێنەیا بکاربینی، ژن د ئیسلامێدا شاهژن و شاهجوانە، جهێ شاهژنا ژی یێ ئاسێ و پاراستییە و هەر کەس نەشێت ببینیت، ڤێجا دڤێت تو خۆ بپارێزی، چونکی تو ژ خفشە غەزالەکێ ژی نازکتری، ڤێجا چاڤێ درندا و گورگا یێ لتە دا تە ب خۆ نێچیر بکەن، هەروەسا تو ژ نێرگزەکێ ژی جانتر و نازکتری، ڤێجا هشیاری هڕەبایا بە دا لبەر نەچی.

حیجاب و پێچا تە بۆ پاراستنا تەیە، ڤەشارتنا جانیا تەیە، ڕێزگرتنا کەساتیا تەیە و ڕێزلێنانا مێیاتی و نازکییا تەیە.

ئەگەر خیلافا زانایا ل سەر پێچێ ل سەر زەمانەکێ بیت کو فیتنە و شوبهە و خرابیێت ئەوێ ژ یێت ئەڤێ گاڤێ کێمتربن، بەلێ نوکە هندی هند خرابی و فەساد یا مشە بووی ئەگەر ژن هەما ژ مال ژی نە دەرکەڤیت بهیچ ڕەنگەکێ مافێ ئەوێ یە، چنکی ڕۆژانە ئەم یێ دبینین و یێ گوهـ لێدبین کا چەند ئاریشە و مالوێرانی یا زێدە دبیت، ڤێجا هەتا ئەو زانایێن دبێژن کو پێچ وخیمار و خێلی ... نەواجبە، بۆ دەمەکێ کو چ فیتنە ژێ پەیدا نەبن، بەلێ

ئەگەر فیتنە پەیدابوون ل ئەوی دەمی واجب دبیت، ڤێجا ما هەوە گوهـلێبوویە ژ ئەڤی سەردەمی خرابترا!

ڤێجا ما ئەگەر دیارکرنا ناڤچاڤا دروستبیت، دێ حیکمەت ژ دروستیا حیجابێ چ بیت؟

ئەگەر دیارکرنا ناڤچاڤا دروستبا، ما بۆچی شەریعەت دا نەهیا ئەوێ کەت ل دەمێ د ئیحراما دا ژ پێچ ودەستگوورکا؟

و ئەگەر دیارکرنا ناڤچاڤێن ژنێ دروستبا، پا بۆچی بەرێخودانا شەرعی هەیە بۆ ئەوێ کچا بوو خۆ ب خازی؟ و ئەگەر دیارکرنا ناڤچاڤێن ژنێ دروستبا بۆچی دەیکێن باوەردارا فەرمان ل ئەوان هاتییە کرن ب حیجابێ؟ هەر چەندە چ زەلاما دل ل سەر دەیکێن باوەردارا نینە؟

و ئەگەر دیارکرنا ناڤچاڤێن ژنێ دروستبا، بۆچی خودایێ مەزن یێ دروست کری کو ژن ل محارمێت خۆ نە یا ب حیجاب بیت؟ و نە واجبە خۆ حیجاب بکەت ل دەڤ ئەوان.

و ئەگەر دیارکرنا ناڤچاڤێن ژنێ دروستبیت، ب ڕاستی ئەڤە ڕێکەکە بۆ بێ ستارەیێ د نوکەدا و خودایێ مە نەهیا کری ژ بێ ستارەیێ.

و ل دووماهیێ ژی:

ئەگەر جیلباب نە ڤەشارتنا ناڤچاڤا بیت؟

و خیمار نە ڤەشارتنا ناڤچاڤا بیت؟

و قیناع نە ڤەشارتنا ناڤچاڤا بیت؟

ئەرێ پا ناڤێ ئەوی قوماشی و پاتەی چییە یێ کو ژن ناڤچاڤێن خۆ پێ ڤەدشێریت؟

بەلێ ئەڤە هەمی دوژمناهیکرنا ستارەیێ، شەرمێ، نخافتنێ و پاراستنێ یە ژ لایێ ڕۆژئاڤای ڤە! هندەک ژی ب هێجەتا ئەوێ خیلافا فقهی یاکو د ناڤبەرا زانایاندا هەی بۆ خۆ بکاردهینن.

ڤێچا ئەی ژنا تو خەمساریێ دکەی د دیارکرنا ناڤچاڤێن خۆدا، بۆ پرسیارکرنا بەرامبەر خودایێ مەزن بەرسڤەکێ بەرهەڤبکە.


وَنَادَيْتُ اللّهُمَّ يَا خَيْرَ سَامِعٍ
... أَعِذْنِي مِنَ التَّسْمِيعِ قَوْلاً
وَمِفْعَلاَ
إِلَيكَ يَدِي مِنْكَ الأَيَادِي تَمُدُّهَا
... أَجِرْنِي فَلاَ أَجْرِي بِجَوْرٍ
فأُخْطَلاَ

خیشکا هێژا:

بزانە ئەڤ جوانییا تە هەی یا ب بهایە و مروڤ تشتێ ب بها نادەتە بەرچاڤ و بەردەستێ هەر کەسێ، بو وی نەبیت یێ ژ هەژی.

و تو نەبە وەکو سترییەکێ نەفسا خۆ ژی و بەرامبەری خۆ ژی ئەزییەت بدەی، هندیکە جوانیە فیتنەیە بۆ تە، ڤێجا تو دلوڤانییێ ب ئەوان گەنجێن بەرزە ببە یێن د ئەڤی سەردەمیدا، تو بزانە ئەی خوشکا من هندی بێ سەروبەرییا د جلکاندا یە دێ بەرێ تە دەتە ئاگری و تە دویرکەت هەتا ژ بێهنا بەحەشتێ ژی.

